# قورئان و سیکیولەری کورد



نووسینی
سەلام ناوخۆش

نارین

# پێشه‌کی

قسه‌کردن له سه‌ر به سیکولارکردنی ده‌قی قورئان یان هه‌بوونی چه‌ند لایه‌نێکی سیکولارکردن له خودی قورئان مه‌سه‌له‌یه‌که زۆر گه‌نگه‌شه و گفتوگۆ هه‌ڵده‌گرێت ! به واتای مه‌سه‌له‌یه‌ك نییه ساغکرابیته‌وه، یان یه‌کلاکرابیته‌وه. وروژاندنی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه له ڕاستیدا زیاتر په‌یوه‌ندی به خود و تێڕوانینی ئه‌و که‌سانه وه‌یه که له ده‌ره‌وه‌ی بازنه‌ی ئیسلامبوونن، که چۆن له قورئان و بایۆگرافی پێغه‌مبه‌ری ئیسلام ده‌ڕوانن، نه‌ك په‌یوه‌ندی به گروپ و بزوتنه‌وه‌یه‌کی ئیسلامی بێت !! ئه‌م مه‌سه‌له‌یه له ئه‌ده‌بیاتی ئیسلامی کوردی زۆر که‌م تاوتوێ کراوه ! زیاتر خۆی به هه‌ندێك شت خه‌ریك کردووه، که دوور و نزیك له گیانی ده‌ق دووره.دیارده‌یه‌کی تر ، که هه‌ر له هه‌ناوی کۆمه‌ڵگای کوردی، که هه‌ر له لایه‌ن ئه‌و که‌سانه ده‌ورێژێنرێ که له ده‌ره‌وه‌ی چوارچێوه‌ی ئیسلامبوونن: هه‌بوونی دیموکراسیه‌ت له ئیسلام و سۆشیالیزم له ئیسلامدا یان وه‌ك مه‌ریوان وریا قانع له کتێبی " دین و دنیا " و ته‌له‌فزیۆنی نالیا" ده‌ڵێت: زۆر ئاساییه حزبێکی ئیسلامی زووتر به دیموکراتیزه بکرێ له حزبێکی عه‌لمانی وه‌ك....یان ئه‌و ئیسلام و مه‌سیحیه‌ت وه‌ك یه‌ك ده‌بینێت! هه‌روه‌ها به ڕای ئه‌و ئیسلام وه‌ك

تەیرێکی ماقوولّ لیَ بکرێت " کە قەبوولّی بێت ژمارەیەك لە ژمارەکان بێت ". ئەو قسانە، نووسینی سیکولەرێکی گەورەی(بە تەمەن گەورە و خاوەن چەندین کتێب) کوردم وە بیر دێنێتەوە، کە لە بەر ئەوەی ئەبا زەری غەفاری ئۆپۆزسیۆنی هەندێ کاری دەسەلاّتی ئیسلامی بوو وزۆر کەیفی بە هەژار و فەقیری موسلمانان دەهات، ئەو سیکولەرەی کورد ناوی لێنابوو یەکەم کەسی سۆشیالیست لە مێژووی ئیسلامدا. کەچی فەقیردۆستی جەوهەری موسلمانبوونی تاکە، لەو ڕوانگەوە ئەبازەر بەرگری لە فەقیرەکان دەکرد، نەك خوانەخواستە باوەڕی بە پرانسیپەکانی سۆشیالیزم هەبووبێ بێت !بابەتێکی تر، کە ئەم نووسینە لە سەری ڕادەوەستێت، مەسەلەی ئەو کتێبانەیە، کە دژی قورئانی پیرۆز نووسراون ! نووسەر باوەڕ وایە، کە ئەو نووسەرانە لە زاتی خودا تێنەگەیشوون یان زۆربەی زۆری تەواو لە زمانی دەقی قورئان تێنەگەیشتوون! ! ئەو نووسەرانە وەك ئینسانێکی ئەکادیمی نە هاتوون دەقێکی قورئان شرۆڤە بکەن و ئەوەی دەڵێن زادەی بیرکردنەوە و عەقلّی خۆیان بێت، بەلکو وەك ئەو توێژەرەی زانکۆ وانە کە هەندێ ناوی هەندێ سەرچاوە و ژێدەری ئەلمانی، فەرەنسی، ئینگلیزی دەهێنن کە نەیانبینیووە وەك ژێدەرێك بۆ

پاڵپشتی گریمانەكەیان بە كاری دەهێنن! ئەو جۆرە خوێندنەوە بۆ قورئان بە چاویلكەی غەیرە-ئیسلامی دوورە لە ئەكادیمیەت و هەروەها قورئانیش دوورە لەو تەرزە دیتنە، چونكە بەر لە ئەوەی باوەڕی ملیارەك و نیو مرۆڤ بێت، ئەوا گوتاری بۆ مرۆڤەكانی دەرەوەی بازنەی خۆیشی تی !!

ئەو كتێبانەی دژ بە دەقی قورئان بڵاوكرایەنەوە زۆربەی زۆری لە لایەن كەسانی ئیسلامی بە كتێبێك و دوو كتێب وەڵامدرایەنەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە تایبەت نییە بە كتێبێكی تایبەتەوە، بەلكو بە شێوازێكی تر دارێژراوە. لە سەر زۆربەی كتێبەكان قسەی خۆمان هەیە، بە واتای تەنیا لە سەر كتێبێكی دیاركراو نییە. ئەم كتێبە لە سەر كتێبێكی دیاكراو یان كەسێكی دیاركراو نییە، بەڵكو لە سەر هەموو كتێبەكان و كەسەكان دەدوێت! ئەم هەمەلایەنیەی كتێبەكە پەیوەستە بە شێوازەكەی كتێبەكە، كە تا ڕادەیەك نوێیە لە نووسینی كوردی.

بۆ ئەوەی خوێنەر تەواو لە كتێبەكە بگات، بەشی یەكەم تایبەتكراوە بە قورئانناسی تا بە تەواوی لە گوتاری قورئان بگات، ئینجا شرۆڤەی قسە و ستراتیژیەتی سیكیولەری كورد بكرێت، كە ئیلحادی خۆی لە نێو حیزبی كوردی شاردۆتەوە. ئەو حزورنەبوونەی

پەیوەستە بە بیرکردنەوەی سیکیولەری کورد و کاردانەوەی ڕەشۆکی کورد دەربارەی ئیلحادی سیکیولەری کورد.

قورئانناسی زانستێکە لە گوتاری قورئان دەدوێت، ئەو گوتارە وەک خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، نەک وەک ئێمە دەمانەوێت، بە ولتایەکی دی، ڕەفتار و گوفتاری مرۆڤ بە پێوەری قورئان دەپێورێت، نەک قورئان لە قالب بدرێت تا لەگەڵ ویست و ڕەفتار و گوفتاری مرۆڤ بپێورێت.

سیکیولەریزم بە دروستی عەلمانیەت ناگەیەنێت.سیکیولاریزم، پەروەردە و ژیان و گوزەران لە دەرەوەی غەیبداری دەبینێت.هەوڵ دەدات هزر و کۆمەڵگا لە چەمکی دینی بپارێزێت.ئەو دووە بە جۆرێک بن لە سەر عەقلانیەت، نەک سروشی یەزدانی ئیشی لە سەر بکرێت.

سەلام ناوخۆش

قورئان دوا کتێبی ئاسمانییە.قورئان دوا پەیوەندی وەحی ئیلاهی کەلامیە بۆ زەوی.ئەو پەیوەندییە ڕۆحی و بەرجەستەییە لە نێوان ئاسمان و زەوی تایبەتە بە ٢٣ ساڵ پێغەمبەرایەتی موحەمەد.کەواتە چۆن حەزرەتی ئیبراهیم بە تەنیا ئومەتێك بوو، موحەمەدیش قورئانێکی پراکتیکی بوو.عائیشە خانی دایکمان لەو بارەیەوە دەیگوت: " موحەمەد خولقی قورئانی بوو...یان هەر قورئانێك بوو لە نێوان خەڵك دەهات و دەچوو."

قورئان بە ٢٣ ساڵ لە مەککە و مەدینە دابەزی.لە ١١٤ سورەت پێکهاتووە. لە ستایل و گێرانەوە و جۆری گێڕانەوە، وەرگر دەرك بەوە دەکات کە دەقی قورئان، دەقێکی ئیلاهیە هەروەها لە مەسەلە ئەلیکترۆنی و غەیبی و بەڵێنەکانی و جیناتەکانی.....تەواو دوورە لەوەی دروستکراوی موحەمەدی نەخوێنەواری سەدەی حەوتی زایینی بێت یان دەرهاوێشتەی عەقڵ و هزر و ئەنێشەی موحەمەد بێت.

ئەوانەی ڕەخنە لە قورئان و موحەمەد دەگرن تەواو ئەو گریمانە دەسلمێنن کە ئەبو جەهلی سەدەی نوێن، چونکە زانیاریان هانیاندەدا لە فیرعەونیەتی خۆیان نێنەخوار، بە شێوازێکی تر، چۆن وەختی خۆی ئەبوجەهل ناسراو بوو بە ئەبوحەکەم و دەیزانی

لات و مه‌نات ته‌نیا بتن هیچیان پێ ناکرێ و خوداکه‌ی موحه‌مه‌د خوایه‌، ئه‌وانه‌ی ڕه‌خنه‌ له‌ قورئان و موحه‌مه‌د ده‌گرن وه‌ك موحه‌مه‌د ئه‌راکۆن و عه‌لی حه‌رب....ده‌زانن ڕه‌خنه‌کانیان بێ بنه‌مان و چۆن ئه‌هریمه‌ن ئه‌بوحه‌که‌می هاندا سه‌رباری ڕاستبوونی پێغه‌مبه‌رێتی موحه‌مه‌د، ئیمان به‌ قورئان و موحه‌مه‌د نه‌هێنێت هه‌روه‌ها که‌سانی دووره‌ جیهانی قورئان ، سه‌رباری ته‌کنه‌لۆژیای سه‌رده‌م، ئیمان به‌ قورئان و موحه‌مه‌د ناهێنن.

## قورئانی مه‌ککی و قورئانی مه‌دینه‌یی

قورئانی مه‌ککی و مه‌دینه‌یی هه‌ر یه‌ك قورئانه‌، ئه‌وه‌ی ئه‌و دوو گوتاره‌ له‌ یه‌ك جیاده‌کاته‌وه‌، ئاراسته‌ و گوتاره‌که‌یان و خوێندنه‌وه‌ی خه‌ڵکه‌.قورئانی مه‌ککی ٨٦ سوره‌ته‌، واته‌ ئه‌و سوره‌تانه‌ی له‌ شاری مه‌ککه‌ دابه‌زیون. قورئان مه‌دینه‌یی بریتییه‌ له‌ ٢٨ سوره‌ت، که‌واته‌ له‌ ١١٤ سوره‌تی قورئان ٨٦ی له‌ ١٣ساڵی نێو شاری مه‌ککه‌ دابه‌زیون.له‌ ١٣ ساڵی یه‌که‌م ئیسلام ده‌سه‌ڵاتی نه‌بووه‌، بۆیه‌ وه‌ك له‌ به‌شی اسباب نزول باسی ده‌که‌ین، قورئان خۆی به‌رنامه‌یه‌ بۆ مرۆڤی هه‌موو چاخه‌کان، نه‌وه‌ك ڕه‌نگدانه‌وه‌ی حاڵه‌تی کۆمه‌ڵایه‌تی یان سیاسی کۆمه‌ڵگای عه‌ره‌بی بێت! ئه‌و ١٣ ساڵه‌ی مه‌ککه‌ هه‌ر ده‌ربه‌ده‌ری و ئازاردانی سیاسی و نانبڕینی

سیاسی و کۆچپێکردنی موسلمانان بووه.پێغه‌مبه‌ر و هاوڕێیانی ئیمانی گه‌وره‌ترین ئازاریان چه‌شتووه و له شاری مه‌ککه شاربه‌ده‌ر کراون! به واتای پێغه‌مبه‌ر و هاوڕێیانی به خۆویستی و خۆهێشتی له زێدی باوك و باپیرانیان كۆچیان نه‌كردووه، به‌ڵکو ئه‌نزیمه‌ی عه‌ره‌بی ئه‌وسا ناچاری کردوون، کۆچ بکه‌ن!

هه‌ندێ ئاماژه و کرداری مێژوویی هه‌ن، که به‌ڵگه‌ن له سه‌ر ئه‌وه‌ی بتوانین سوره‌تی مه‌ککی له مه‌دینه‌یی جیابکه‌ینه‌وه:

**سوره‌تی مه‌ککی**

١. سوره‌تی مه‌ککی له پێش سوره‌تی مه‌دینه‌یی دابه‌زیون.

٢. سوره‌تی مه‌ککی له پێش "کۆچپێکردن " و ده‌سه‌ڵاتی ئیسلامی دابه‌زیون.

٣. سوره‌تی مه‌ککی مۆرکێکی بیناکردنی په‌روه‌رده‌ییان هه‌یه.

٤. سوره‌تی مه‌ککی باسی جیهاد به (شیر–شمشێر) ناکه‌ن.

٥. هه‌موو سوره‌ته‌کانی مه‌ککی له‌فزی " کلا" تێدایه.

٦. هه‌ندێ له سوره‌ته‌کان سوجده‌یان تێدایه.

٧. باسی چیرۆکی ئاده‌م و حه‌وا و شه‌یتان–یان تێدایه.

ڕەوتی ئیسلامی هەیە ئەو سەردەمە، ژیانی ژێردەستە لە مەککە، بە پلاتفۆرمی حیزبەکەی دەزانێ و دەیەوێ تەنها کار لە سەر پەروەردە و ئیصلاح بکات، قۆناغی مەدینە و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی مەدینە و جیهاد فەرامۆش دەکات.

## سورەتی مەدینە

١. ئەو سورەتانە لە پاش کۆچپێکردن دابەزیون.

٢. گوزارشت لە جیهانبینی ئیسلام دەکەن.

٣. ژمارەیان کەمە.

٤. باسی دەسەڵاتی تاکی موسلمان دەکەن.

٥. ئاماژە بە جیهاد دەکەن.

٦. باسی هەبوونی جوولەکە لە مەدینە دەکەن کە چ سیفەتێکیان هەیە.

٧. قسە لە سەر بەرەنگاری دەسەڵاتی عەرەبی و غەیرە عەرەبی دەکەن.

هه‌ندێ ڕه‌وتی ئیسلامی قۆناغی ده‌وڵه‌تی مه‌دینه ده‌که‌نه بنه‌ما بێ ئه‌وه‌ی ڕه‌چاوی قۆناغی ژێرده‌سته‌یی مه‌ککه و هه‌بوونی کۆمه‌ڵگای ئیسلامی بکه‌ن.

سوڕه‌تی مه‌ککی و مه‌دینه‌یی گرینگن بۆ بیناکردنی که‌سایه‌تی په‌روه‌رده‌یی و ده‌وڵه‌تکاری موسلمان. ده‌بێ موسلمان وه‌ك ناوی دینه‌که‌ی ئاشتی په‌روه‌ر بێ و کار له سه‌ر ئه‌وه بکات کۆمه‌ڵگایه‌کی دادگه‌ر دروست بکات هه‌روه‌ها ده‌بێ وه‌ك ناوی قورئان بێ: مه‌به‌ستی بێت هه‌موو تاکه‌کان خوێنه‌وار بکات و کۆمه‌ڵگایه‌کی هۆشمه‌ند بینا بکات.

که‌واته هه‌ردوو جۆری سوڕه‌ته‌که یه‌کن ته‌نها له دوو کۆمه‌ڵگا دابه‌زیون: کۆمه‌ڵگای مه‌ککی ژێرده‌سته‌یی، کۆمه‌ڵگای مه‌دینه‌یی ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی.

## قورئان و هۆکاری دابه‌زین ناسراو به ئه‌سبابی نزول

بۆ ئه‌وه‌ی ئاراسته‌یه‌ك بکه‌نه واقیع له واهیمه‌ی مرۆڤ، سیکیوله‌ری کورد شرۆڤه‌یه‌کی نالۆژیکی بۆ ده‌قه‌کانی قورئان ده‌که‌ن.قسه‌کردن له سه‌ر فاکته‌ری دابه‌زینی ده‌قه‌کانی قورئان له لایه‌ن سیکیوله‌ری کورد، به کورتی به‌ستنه‌وه‌ی قورئانه به سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ره‌وه. مێژوویێك له زه‌ینی خۆیان بۆ قورئان داده‌رێژن به‌وه‌ی وه‌ك ته‌ورات و ئینجیل تایبه‌ت بووه به سه‌رده‌می هاتنه‌خواره‌وه‌ی قورئان. له زه‌ینی ئه‌و ڕه‌وته هزریه، دوای کۆچی دوایی موحه‌مه‌دی پێشه‌وا، کۆتایی مێژوو ده‌ستی پێکردووه. د.یه‌حیا موحه‌مه‌د له وتارێکدا که مامۆستا ئیسماعیل وه‌ریگێڕاوه و له ژماره (٩) ی گۆڤاری ڕینوین بلاویکردۆته‌وه ده‌لێت: " له (٦٢٣٦) ئایه‌ت ته‌نها(٤٢٧) ئایه‌ت هۆی دابه‌زینی هه‌یه." ئه‌مه‌ش باشترین به‌لگه‌یه که قورئان ڕه‌نگدانه‌وه‌ی سه‌رده‌می خۆی نییه، به‌لکو هه‌تا ڕۆژی دوایی کاریگه‌ری هه‌یه.کۆچی دوایی دوو پالپشتی خزمی پێغه‌مبه‌ر: یه‌که‌میان، خه‌دیجه‌ی هاوسه‌ر و دایکی منداله‌کانی دووه‌میان ئه‌بوتالیبی مامی پێغه‌مبه‌ر و باوکی عه‌لی کوڕی تالیب ئاماژه‌یان پێ نه‌کراوه و قورئان به ده‌قێك دلی پێغه‌مبه‌ری نه‌داوه‌ته‌وه.ئه‌گه‌ر تایبه‌ت بووایه به سه‌رده‌می ده‌سه‌لاتی

قورەیشی: ئەوا ئاماژەیەکی بە مردنی ئەو دووە دەکرد یان لەبەر دڵی پێغەمبەر وایدەکرد ئەبوتالیب بە موسڵمانی بمرێ؟ ئیلاهییوونی قورئان لەوەدایە هەتا "پێغەمبەریش لە دەسەڵاتی نەبووە ئەوەی خۆشی دەوێ هیدایەتی بدات، بەڵکو هیدایەتدان تایبەتە بە زاتی خوداوە."[٣]

بۆیە ئەوانەی دەقەکانی قورئان دەبەستنەوە بە سەردەمی پێغەمبەرەوە، تەواو لە گوتاری قورئان ناگەن ! جا چۆن تێبگەن ئەوان بە دروستی نازانن نایەتێکی قورئان بخوێننەوە.

# قورئان و كه‌لتور

كه‌لتور بوونێكی له‌ مێژینه‌ی ڕه‌گ داكوتاوه. قورئان له‌ كۆمه‌ڵگای عه‌ره‌بی دابه‌زی، به‌ڵام هه‌موو كه‌لتوری عه‌ره‌بی ڕه‌تنه‌كرده‌وه، به‌ڵكو ئاوساوی كرد به‌ بارگه‌ی تر، به‌ واتایه‌كی ترقورئان هه‌مان فۆڕمی پاراست، به‌ڵام خوێندنه‌وه‌یه‌كی دی بۆ كرد. له‌ كه‌لتوری عه‌ره‌بی ده‌گوترا: "**انصر أخاك ظالما أو مظلوما** –برای خۆت سه‌ر بخه‌ سته‌مكار بی یان سته‌ملێكراو بی" قورئان هه‌مان فۆڕمی پاراست، به‌ڵام چه‌مكی "انصر–پاڵپشتی" ته‌واو گۆڕدری: كه‌لتوری عه‌ره‌بی ده‌یگوت پاڵپشتی برای ڕه‌گه‌زیت بكه‌ با سته‌مكاریش بیٚ، كه‌چی ئیسلام ده‌ڵێت پاڵپشتی برای ئیمانیت بكه‌ بۆ ئه‌وه‌ی سته‌م له‌ خۆی و كه‌سی به‌رامبه‌ر نه‌كات، چونكه‌ زاتی خودا سته‌می له‌ سه‌ر خۆی حه‌رامكردووه‌ هه‌روه‌ها زاتی خودا له‌ قورئان فه‌رموویه‌تی: " خودا سته‌م له‌ هیچ به‌نده‌یه‌ك، كه‌سێك ناكات...به‌ڵكو ئه‌وه‌ كه‌سه‌كانن سته‌م له‌ خۆیان ده‌كه‌ن."

په‌روه‌رده‌ی سیكیوله‌ری كورد ئه‌وهایه‌، ده‌بێت سنووری خودا ببه‌زێنێت به‌وه‌ی هه‌ندیٚ ئاكار و گوفتار و كردار ده‌رهاویشته‌ی كه‌لتورن، كه‌لتور ناسنامه‌ و پیرۆزی پێداون، نه‌وه‌ك زاتی خودا.

ئه‌وان ئه‌و شتانه به زاری خوداوه ده‌گوازنه‌وه بۆ خه‌ڵکی عه‌وام به به‌شێك له دینی خودای ده‌ناسێنن!

نموونه‌ی " به‌ردی گه‌وره و به‌ردی بچووك " به‌شێکه له که‌لتوری کوردی و ڕه‌گێکی دینی هه‌یه به مانا جیاوازه‌که‌ی وه‌ك خودا ده‌فه‌رموێ: " لا تقربوا الصلاة.........." به‌و دابڕینه‌ی ته‌واوی ده‌ق له کۆنتێکست " و انتم سکاری" و کرتاندنی ده‌ق: کوشتنی پایه‌کی ئیسلامه یان هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی ئایه‌تی نوێژه. فه‌رموده‌یه‌کی پێغه‌مبه‌ر هه‌یه ده‌فه‌رموێ: " له ئێمه نییه هه‌ر که‌سێ ڕێز له گه‌وره نه‌نێت و ڕێز له بچووك نه‌نێت." هه‌روه‌ها له کۆمه‌ڵگا به‌ردی گه‌وره و بچووك بوونی هه‌یه، به‌ڵام نه‌وه‌ك هه‌بوونی ئه‌و دووه بۆ سه‌پاندنی سته‌م لێکبدرێته‌وه. یان بوونی ده‌سه‌ڵاتێکی سته‌مکار و توێژێکی سته‌ملێکراو ئیلاهی بێت ، ئه‌و هه‌موو شرۆڤانه له جه‌وهه‌ری دینی خودا به‌ده‌رن. ئه‌وه که‌سه‌کانن فیرعه‌ونیه‌ت و دکتاتۆریه‌ت دروست ده‌که‌ن، بۆیه ئه‌و ده‌ستو پێوه‌ندانه، که ئه‌و ده‌سه‌ڵاته ڕه‌هایه به سه‌رکرده‌یه‌ك ده‌ده‌ن، تاوان و گوناهی ئه‌و فیرعه‌ونانه هه‌ڵده‌گرن.

بۆیه ئه‌و حاڵه‌تانه‌ی له‌گه‌ڵ ڕۆحی ئیسلام هه‌ڤدژن، ئه‌وه ده‌رهاویشته‌ی که‌لتورن. قورئان له هه‌بوونیان به‌رییه.

## دەروازە:

چەمکی عەلمانیەتی ئیسلام، هیچ پەیوەندی بە ئیسلامەوە نییە، بەڵکو ئەوە خوێندنەوەی رۆژئاوایە بۆ ئیسلام. لە رۆژئاوا، دین تەنها دینێکی مردووی و زیندانکراوی ناو کەنیسەیە، کە دەوترێ کتێبی پیرۆز مەبەست لێی دەقی دینی: (پەیمانی کۆنold testament و پەیمانی نوێnew testament)-ە.

لە رێگای چەند میتۆدێکی وەك رەخنەی مێژوویی و هەڵوەشاندنەوەو بونیاد گەری و کۆمەڵناسی مەعریفی تێکستی ئایینی و مەعریفی بونەتە دەقێکی ئەدەبی بێ گیان و لە هەموو جۆرە پیرۆزیەك دارمێنراون! لەسەر ئەم شەنگست و بنەمایانەوە رەوتێکی سیکۆلاریزمی رۆژئاوایی و چەند نوسەرێکی رۆژهەلاتی وەك محمد ئەرەکۆن، حەسەن حەنەفی، نصرحامد ئەبوزێد، عەلی حەرب...هتد ئەمرۆ دروست بوون و دەیانەوێ بەو میتۆدانە هەمان خوێندنەوە بۆ قورئان بکەن.

ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر، بە حوکمی ئەوەی سیستەمی فەرمانرەوایی ئیسلامی، سیستەمێکی لاهوتی- theology نییەو خەلیفە caliphate، خەلیفەی سیستەم و فەرمانرەوای مرۆڤەکانە

نەك خەلیفەی خودا!! ئەم چەمکە رووبەرێکی زۆر فراوان لە هزر و فیکر و فیقهی ئیسلامی بۆ بیرکردنەوە و عەقل و هزری مرۆڤ والاکردووە. ئەم هەقیقەتە زۆرێك لە رۆژهەلاتناس و ئەو نوسەرە سیکۆلاریزمانەی رۆژهەلاتی سەرسڕمان و گومرا astray کردووە. بوونی مرۆڤ لەو سیستەمە وەی لە هەندێ لە ڕۆژئاواییەکان کردووە ئیسلام بە دینێکی عەلمانی ببینن، چونکە ئەو دنیادۆستیە لە کتێبی پیرۆز غائیبە، بۆیە ئەوان لە مێژووی ئاین لە ئەوروپا وا لێ ڕاهاتوون، کە ئایینی مەسیحیەت ڕێ بەو جۆرە بیرکردنەوانە نادات. ئەوانە هاتوون ڕەخنە لە قورئان دەگرن و بانگاشەی ئەوە دەکەن کە بنەماکانی عەلمانیەت نەك هەرلە رەفتارو گوفتار و گوتاری ئیسلامی بەرجەستەیە بەلکو لە هەناوی قورئانیشدا هەن!

ئەم کورتە بەشە پێکۆلی ئەوە دەکات لە زێدەری زانیاری نوسەرانی وەك محمد ئەرەکۆن و هاشم صالح و عەلی حەرب و نصر حامد سەرەتا ئەبوزێد بکۆڵێتەوە و ئەوە بسەلمێنێ، کە ئەوان جگە لە لە دووبارە کردنەوەی قسەی دەشتەکییەکانی سارای عەرەب و قورەیشییە بەراییەکان و رۆژهەلاتناسەکان هیچی تر نالێن! بە هیچ جۆرێ قسەکان و ڕەخنەکانیان دەربارەی قورئان دەرهاویشتەی عەقلی خۆیان نییە !! هەرچی ئەو توێژە سیکۆلریستانەی کوردن

(ئه‌م زاراوه رۆژئاواییه‌م به کارهێناوه بۆ ئه‌وه‌ی له عه‌لمانیه‌تی عه‌ره‌بی جیای بکه‌مه‌وه، چونکه زاراوه عه‌ره‌بییه‌که ته‌واو نییه و گومڕاکه‌ره.) ئه‌وه به حوکمی ئه‌وه‌ی سه‌رچاوه‌کانی رۆژهه‌لاتیان به زمانی ئه‌لمانی، فه‌ره‌نسی، ئینگلیزی ده‌ست ناکه‌وێ و تێیان ناگه‌ن، ئه‌وه ته‌نها قسه‌کانی که‌سانی وه‌ك محمد ئه‌ره‌گۆن و ئه‌وانی تر "به کوردی" به کورد ده‌فرۆشنه‌وه! ئه‌وان کورد ده‌ڵێت: ته‌قلیدی ته‌قلید ن ، چونکه ئه‌وه‌ی ده‌رباره‌ی قورئانی پیرۆز ده‌ڵێن زاده‌ی عه‌قڵ و مزری خۆیان نییه، به‌ڵکو له خوێنه‌رانی داگیرکه‌رانی کوردستانی گه‌وره وه‌ریانگرتووه، نه‌ك به ڕاستی ڕۆشنبیرانی ئه‌و نه‌ته‌وانه، چونکه هه‌موو ده‌زانین که ژماره‌ی خوێنه‌واران زۆر و بۆره، به‌لام ژماره‌ی رۆشنبیرانی هه‌ر نه‌ته‌وه‌یه‌ك له چاو ژماره‌ی خوێنه‌واران که‌مه. هه‌ر ئه‌و ژماره که‌مه وه‌ك قورئان خۆی ده‌فه‌رموێ: " ئه‌دگاری که‌سانی ده‌گمه‌نه هه‌ر ئه‌وانیش له کۆتایی به سه‌ر زۆربه‌ی زۆر و بۆر زاڵ ده‌بن" هه‌ر ئه‌وانه ده‌توانن گۆڕان له کۆمه‌ڵگا بکه‌ن، بۆیه سیکیوله‌ره کورده‌کان ته‌نیا ئاماژه به که‌سانی" خوێنه‌وار " و هه‌ندێ گومڕا له بینینی ڕاسته‌ڕێ به چاوی ئه‌قڵ، نه‌ك چاوی ئاسایی ده‌که‌ن!

# بەشی دووەم

# سێکشنی یەکەم

# ژێدەری ڕەخنەگرتن لە قورئان

## محمد ئەرەگۆن و عەلی حەرب و نصر حامد ئەبوزێد

## چۆن لە قورئان دەڕوانن؟!

# محمد ئه‌ره‌گۆن ١٩٢٨-٢٠١٠

ئه‌ره‌گۆن یه‌کێ له‌و که‌سانه‌یه حزوری زۆری له پانتایی که‌لتور و ڕۆشنبیری سیکیوله‌ری کوردی هه‌یه، هه‌ر له‌و ڕوانگه‌وه یه‌کەم که‌س ده‌بێت که گفتوگۆ له سه‌ر حزوری هزری ئه‌ره‌گۆن ده‌که‌ین. ئه‌ره‌گۆن ١٩٢٨- ٢٠١٠ نوسه‌رێکی به‌ربه‌ری جه‌زائیر بووه، هێنده له‌ژێر کاریگه‌ری ڕۆژهه‌ڵاتناسی دابووه هه‌تا ئه‌وه‌ی به وردی نوسینه‌کانی بخوێنێته‌وه ده‌رك به‌وه ده‌کات، که ئه‌ره‌گۆن نه‌ك هه‌ر قسه‌که‌ری spokesman ئه‌وان بێت، به‌ڵکو له زۆر شت به‌تایبه‌تی ده‌رباره‌ی (قورئان) لێ یان رازی نه‌بێ! وه‌ك بڵێی ئه‌وه‌ی ئه‌وان ده‌رباره‌ی قورئان (له ڕووی زانیاریه‌وه) ده‌یڵێن، که‌مه. له‌و باره‌یه‌وه هه‌ر خۆی ده‌رباره‌ی ڕه‌وشه‌که، به ڕاشکاوی ده‌نوسێ: "توێژینه‌وه‌کانی ڕۆژهه‌ڵاتناسی نه‌یانتوانیوه له چوار چێوه‌ی وه‌سف رزگاریان ببێ و ببن به دیراساتی ره‌خنه‌یی ته‌فکیکی قورئان! "مه‌سه‌له‌ی "ته‌فکیکی-هه‌ڵوه‌شانده‌وه‌ی " قورئان له مێژه هه‌ندێ له ڕۆژهه‌ڵاتنناسه‌کان قسه‌ی خۆیان له سه‌ر کردووه هه‌تا هه‌ندێ توێژه‌ری کوردی پابه‌ند به یاسا و ڕێساکانی قورئان ماسته‌ر و دکتۆره‌که‌یان له سه‌ر "قورئان و ڕۆژهه‌ڵاتنناسه‌کان " یان " فه‌رمووده‌کانی پێغه‌مبه‌ر و ڕۆژهه‌ڵاتنناسه‌کان " وه‌رگرتووه !!

بانگاشـاکانی ئـەرەگزن دەربـارەی قورئـان ئێژن، بـەلام تـەنها جـەخت لەسـەر ئەوانـە دەکـەین، کـە ئـەو بـە دروسـتی لـە ڕۆژهەلاتناسەکانی وەرگرتووە و کەچی ئـەوان بـە کەمتەرخـەم لـەو ڕووەوە دەزانێ و نوسەرە سیکۆلاریزمەکانی کوردیش ئـەو قـسانەی ئەویان، جارێکی تر (بەناوی خۆیانەوە!) بڵاویان دەکەنەوە. بـا لـە خوارەوە ئاماژە بە بانگەشانە بکەین:

## یەکەم: بـانگاشەی مێژوویەتی (دەقی) قورئانی

ئەم تیۆرە بانگاشەی داڕنینی هەموو جۆرە پیرۆزیـەك لـە دەقـی ئایینی دەکات. بە گوێرەی ئەم تیۆرە هیچ جیاوازیەك نییە لە نێوان دەقێکی ئاینی و دەقێکی ئەدەبی یاخود مێژوویی. وێـرای ئەمـەش، ئەم تیۆرە بانگاشەی ئەوەش دەکات کە هەر دەقێك هەر ناسنامە و سیما و ئەدگارێکی هەبێ، لە ژێر کاریگەری دەقێکی تـر دا دەبێـت و کار لە دەقێکی تر دەکات، بە واتای ئەوەی لە قورئـان هـاتووە، لـە ژێر کاریگەری ئینجیل و شیعری جـاهیلی دابووە! لـەو بـارەوە زۆر کتێب و وتار بلاوکراینەوە. تەها حوسێنی میسری لە پێشەوەی ئەو نووسەرانە بوو، کە باوەڕی بەو تیۆرە بوو و هەتا کتێبێکـی نووسـی بە ناوی شیعری جاهیلی !

زۆربەی کتێبەکانی ئەرەکۆن دەنوسێ: "ئەرەکۆن لە رێگەی بەکارهێنانی میتۆدی ئاماژە دەیەوێ خوێنەری موسولمان لە هەژموونی دەقە پیرۆزەکان رزگار بکات" ئەو رایەش لە سەر خودی قورئان، دەرهاویشتەی هزری ئەرەکۆن نییە، بەڵکو قورەیشیە جاهیلەکان بەر لە رۆژهەڵاتناسەکانیش قسەی وایان دەگووت بۆ پاراستنی دەسەڵاتی عەرەبی.ئەو بە ئەستورە بینینی دەقی قورئان‌و گوتاری قورئان وەك قورئان بە گێرانەوەیەکی ئیلاهی خۆی پێمان دەڵێت، کە پێغەمبەرێکی وەك نووح ٩٥٠ ساڵ داوای بۆ بانگەوازی یەزدانی کرد، کەچی پیاوانی دەسەڵات و ڕەشۆکەکان بانگەوازەکەیان بە ئەفسانە و قسەی بەر ئاگردان دەزانی.گوێی خۆیان دەگرت بۆ ئەوەی گوتاری خودا لە مرۆڤێکی وەك خۆیان نەبیستن.

## سێیەم: ئاکرێ قورئان سەرچاوەیەکی تەشریعی بێ

چەند ساڵێك پێش ئەرەکۆن، مستەفا کەمالی دامەزرێنەری تورکیای نوێ وتویەتی زەمەنی ئەوە بەسەر چوو کتێبێك باسی هەنجیرو زەیتون بکات بانگاشەی ئاسمانی بکات و حوکمی ئێمە بکات!! مستەفا کەمال جگە لە پیاوێکی عەسکەری چی تر نەبوو

خاوەن هیچ فەلسەفەیەکی سیاسی یاخود میتۆد و زانست و هزرێک نەبوو، بەلام چونکە پیاوی ئینگلیز بوو هەموو ستراتیژیەکانی ئینگلیزی لە تورکیای نوێ پیادەکرد و عەلمانیەتی ئیلحادی و دکتاتۆری و شۆڤینی بەسەر تورکیای نوێ دا سەپاند! ئەرەکۆنیش وەك مستەفا کەمال و عەلی عبدالرزاق و بانگاشەی ئەوە دەکات، کە ناکرێ قورئان وەك یاسایەك شەریعەتەکەی لە دەولەت بەکاربێ! لەویارەیەوە دەنوسێ: "ئەوە وەهمێکی گەورەیە کە خەلك چاوەرێ ی پەیوەندیەك لە نێوان قورئان و شەریعە بکات؟!"

وێرای ئەمانەش، ئەرەکۆن لە رێگای چەند میتۆد و تیۆری ترەوە هەلوەشانکەریی، ئەستروپولۆژیایی دینی و کۆمەلناسی مەعریفە، دەیەوێ هەموو پیرۆزییەك و ئاسمانییەك لە قورئان دا ببرێ... ئەمانەش هیچیان نوێ نین ، چونکە لەسەردەمی زێرینی مارکسیەتدا هەموو خوێنەرێکی جدی ئەو ئەفسانانەی لە مارکسیەتی دیالێکتیکی خوێندۆتەوە و بۆشی دەرکەوتووە کە بە هیچ پێوەرێك و میتۆدێك ناکرێ قورئان لە هەژموونی غەیب و پیرۆزی و "هەرزەمەنی" دەربهێنێ. وێرای ئەوەش ئەو خوێندنەوەیەی بۆ ئینجیلەکان کراوە، بۆ قورئان ناکرێ، چونکە قورئان وەك (دەق text) مامەلەی لەگەل ناکرێ و لە ژێر

کاریگەری هیچ دەقێک دا نەبووە و نابێ! دەوڵەتە موسلمان نشینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین لەو ڕێگەوە قورئان ناکەنە ژێدەری موتڵەقی دەستوری دەوڵەت، بەڵکو بە ژێدەرێك لە ژێدەرەکانی شەرعیەت دایدەنێن.لە باشووری کوردستانیشدا سیکیولەری وا هەن، کە پێکۆلی ئەوە دەکەن قورئان نەبێتە سەرچاوەی بنەڕەتی دەستوور.

## نەسر حامد ئەبوزێد ١٩٤٣- ٢٠١٠

نەسر حامد ئەبوزێد لە رۆشنبیری ئەمرۆدا زیاتر کاری لەسەر "هەژموونی دەق" و "هێرمۆنتیکا" کردووە. ئەو دووەش، زیاتر دەرهاوێشتە و زادەی کەلتوری رۆژئاوان لەسەر قورئان. هێرمۆنتیکا، یاخود تاویل زاراوەیەکی کەنیسیە لە بواری دیراساتی سیۆلۆژی بەکاردەهات. لە بنەرەتیش، ئەو تیۆرە هەر بۆ شرۆڤەکردنی کتێبی "پیرۆز" بووە. ئەبوزێد وەك ئەرەکۆن، لە زۆربەی کتێبەکانی وەك (اشكالیه القراءه والیات التاویل مفهوم النص دراسه فی علوم القرأن) هەروەها دکتۆرا نامەکەی: فلسه التاویل.....هتد دەیەوێ ئەو تیۆرە رۆژئاواییە لەسەر قورئان تاقی بکاتەوە و خۆی وتەنی دەبێ مرۆڤ لە هەژموون و دەسەلاتی دەق رزگاری ببێ. لەبارەی قورئان و هەژموونی دەقی قورئان لە چەند شوێنێ دەڵێ: "القران هو النص الاول والمركزي في الثقافة... لقد صار القران هو النص بالف ولام العهد... فالنص نفسه —القران— يؤسس ذاته دينا وتراثا في الوقت نفسه..." لە "الامام الشافعی و تاسيس الايدولوجية الوسطية" بە ئاشکرا دەڵێ: کاتی ئەوە هاتووە کە قۆناغی موراجەعە و گواستنەوە ببەزێنین بەرەو قۆناغی رزگارکردنی نەك تەنها لە دەسەلاتی دەق بچین، بەڵکو خۆمان

رزگار بکەین لە هەموو دەسەلاتێك ، کە ئاستەنگ بۆ کاروانی مرۆڤ لە جیهان دادەنێ... پێویستە هەرزوو هەر ئێستا ئەمە بکەین بەر لەوەی تۆفان رامانمالێ"! ئەو دید و بۆچوونانەی ئەبو زێد هیچ شتێکی زیاتری لەوەی رۆژهەلاتناسەکان و ئەرەگۆن زیاتر نییە، ئەوەندە نەبێ ئەبوزێد هەوڵ دەدات لە بریتی تەفسیری قورئان تاویل بۆ قورئان بکات، تاویل یش لای ئەو هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەی مانا. ئەو مانایەی ئەو بە دوای وێڵ بوو لە هەوڵ و ئاکامەکانی ئەرەگۆن تێپەڕی نەکرد! هەر بۆیە هەر قسەکانی ئەرەگۆن لە بارەی مێژوویەتی لە چەند شوێنێك دووبارە دەکاتەوە: "قورئان دیاردەیەکی مێژووییە.....قورئان بەرهەمێکی زمانەوانییە...قورئان ڕۆڵەی ژینکەکەیەتی.."

ئەو تەرزە بیرانەش کەم و زۆر خۆیان لە نووسینەکانی سیکیولەری کورد دەنوێنن.کێشەی سیکیولەری کورد تێگەیشتنە لە خودی دەقی قورئان، بۆیە پەل دەهاوێژن بۆ کەلتوری فارسی و عەرەبی، لەو توراسانە دیدێکی سیکیولەری کوردی دەربارەی قورئان فۆرمەلە دەکەن. یان ئەوانەی لە هەندەران کەلتور و زمانی بیانی فێردەبن، بە دیدێکی مەسیحی یان لیبرالی لە خودی قورئان دەڕوانن، بۆیە وێنەیەکی تەلخ و شێواو لە زەینیان دروست دەبێ و دەیانەوێ خوێنەری کورد بەو وێنە شێواوە ئاشنا بکەن.

# عەلی حەرب

عـەلی حـەرب ڕۆشـنبیرێکی تـرە کـەم و زۆر لـە ڕۆشـنبیری سیکیولەری بوونی هەیە.عەلی حەرب قسەی جیاوازتر لە ئەرەکۆن و ئەبوزێـد دەڵێـت.قـسەکانی ئـەو لـە سـەر خـودی قورئانـە، نـەك دەرەوەی قورئان.عەلی حەرب لـە هـەردوو کتـێبی (نقـد الحقیقـە) و (نقد النص) بە جۆرێکی جیاوازتر لە محمد ئـەرەکۆن و نەسر ئـەبو زێد قسە لەسەر "عەلمانیەتی ئیسلام" دەکات: ئەو هەوڵ دەدات لە دەرەوەی لێکدانەوە و راڤە کردنە جیاوازەکانی ناو گروپ و رێبـازو تایفـە جیاوازەکـانی ئیـسلامدا بـوار و ئەگـەری بـە عـەلمانی کردنـی ئیسلامی بدۆزێتەوە. ئەو نایـەوێ وەك جـەمال بـەنا قـسە لـە سـەر ریفۆرمی ئایینی ئیسلامی بکا یان وەك محمـد ئـارکۆن قورئـان بـە ئینجیل بکا، بە لام وەك حەسەن حەنەفی لە ناو ئیسلامی پراکتیکیدا دوور لە تێکستە پیرۆزەکاندا بـە دوای "عەلمانییـەتی ئیسلامی " دەگەڕێ ..بە قەولی خۆی هـەر لـەوێوە "بـە میتـۆدێکی شـیکاری و دیدێکی رەخنەگرانەوە مێژوو و کەلەپوری ئیسلامی دەخوێنێتەوە و لەوێشەوە ئەو رەگ و ریشە عیلمانیانەی دەست نیشان دەکـات کـە بە هۆی پراکتیکە سیاسی و کۆمەلایـەتی و شـەرعیەکانەوە دروسـت بوون". گ. سەرچاوە، ژ. ٨، ل ٥٤-٥٥.

ئەو خوێندنەوەی عەلی حەرب بۆ دەرەوەی دەق و قسەکردن لەسەر ئیسلامی پراکتیکی لە حوکم و کۆمەڵ و شەریعەتدا هەر دۆزینەوەی خۆی نییە، ئەوەتە خۆی بە راشکاوی لە دیدارێکی "الشرق الاوسط" دەڵێ: **"وانا لا ادعي اننا كعرب انتجنا نظريات و مفاهيم جديدة قياسا لما هو منتج في العالم"!** عەرەبی ناو بازنەی سیکولاریزم وەك کوردی ناو ئەو بازنەیە، نەیتوانیوە هزری تایبەت بە خۆیان بئافرێنێت بۆ ئەوەی ناسنامەی کەلتوری خۆی هەبێ وەك بیرمەندێکی رەسەن نەك بیرمەند و هزرڤانی ناو دیماگۆژیەتی راگەیاندن بناسرێ. ئەو کۆنفراسەی ئەستەنبول کە بەناوی **"مؤتمر العالمي لفلسفة و مؤتمر الاتحاد العالمي لمنظمات الفلسفة"** بەسترا، کە (١٧٠٠) فەیلەسوف و زانای (٨٥) دەوڵەت ئامادەبوون (هیچ) یان عەرەب نەبوون!!

رۆشنبیری کەلتوری عەرەبی سیکولاریزمی رەسەن نی یە، خۆرسك نییە، بەلکو دوو رەگیە هەروەك چۆن ئەرەکۆن نکۆلی لەوە ناکات، ئەوە عەلی حەربیش دەڵێ: **"انا سليل القران كما انى**

**سليل جمهورية افلاتون و ابن عربي وايضا ميشل فوكو...** "

ئەمەش باشترین بەڵگەیە، کە نووسەر بە زاری خۆی دەڵێ: "کە ئەوەی ئەو دەنووسێت زادەی بیرکردنەوە و ئەقڵی خۆی نییە، بەلکو ژێدەرە هزرییەکانی ئەو، ئەو کەسانەن کە لە دەرەوەی هزری زاتی مرۆڤ خۆین و دژ بە هزری دینین، بە تایبەتی ئیسلام."

دیتنی ئەدگارەکانی عەلمانیەت –دنیاگەری لە ئیسلامدا، لەوە سەرچاوەی گرتووە، کە هەموو پرانسیپەکانی قورئان غەیبی و لە سەر ئەودیوی سروشت و میتافیزیکا دانەمەزراون، بەڵکو قورئان خۆی داوا لە موسلمانان دەکات " بەشی خۆیان لە دنیا لە بیر نەکەن ".

کەسێکی دی نەژاد و مەزهەب جیاواز لە ئەرەگۆن و ئەبوزێد و عەلی حەرب، کە ئامادەگیەکی بەرفرەی هەیە لە نووسینی سیکیولەری کورد، تەنانەت ئیسلامی کورد، عەبدولکەریم سروشە.هەرچی لێرە دەربارەی هزری سروش تۆماری دەکەم پێشتر لە گۆڤاری ڕینوێن و کتێبی " مرۆڤی نیاندرتاڵ " ئاماژەم پێکردووە.

# سروش و قورئان

چونکە قورئان دەقێکی ئیلاهیە جیاواز لە دەقی مرۆکردە لە گوتار و ستایل و دارشتن و گێڕانەوە لە ناو گێڕانەوە وەی دکتۆرێکی مەسیحی شارەزا لە عەرەبی کردووە، بڵێت: " قورئان دەقێکی ئیلاهیە، ئەگەر سوور بین لە سەر ئەوەی محەمەد نووسی بێتی، ئەوە دەبێ دان بەوە بنێین خودی موحەمەد خودایە." لەو روانگەوە، تێدەگەین بۆچی سێ جار خودا لە سێ ئایەتی جودا فەرموویەتی: " وەك پێویست قەدری خودا ناگرن.." ئەگەر وەك پێویست ئەرەکون.....و سروش قەدری مەعریفە و هەژموونی خودایان بگرتایە، تەمەنی خۆیان لە بێهودەیی بە سەر نە دەبرد.

# ڕۆژهەڵاتناسی و قورئانی پیرۆز

ئەوانەی ئەوانە دەربارەی قورئان دەڵێن، زۆربەی زادەی هزری خۆیان نییە، بەلکو دەرهاوێشتەی ڕۆژهەڵاتناسییە.کەمێك لەوەی لە ڕۆژهەڵاتناسی دەگوترێ دیتنی مەعریفیە و بریتیە لە شرۆڤەکردنی میزاژ و داب و نەریتی تاکی ڕۆژهەڵاتیە، بەڵام ئەوەی دەربارەی قورئان دەیلێن لە ژێدەری لێڵ و گوماندار سەرچاوەی گرتووە.

زۆر لە سەر ڕۆژهەڵاتنناسی نووسراوە! پێویست ناکات بە باش و خراپ زۆر لە سەر ئەو مەسەلەیە بوەستین.ڕۆژهەڵات و کەلتوری ڕۆژهەڵات، بە واتای ئایین و ئەدەب و زمان و عادات و تەقالیدی ڕۆژهەڵات وای لە پیاوانی دەسەڵات و پیاوانی ئایینی یەهودی و مەسیحی و کەمێك لە زانستکاران کردووە، توێژینەوە لە سەر پەرشی ئایین وئەدەب و زمان و عادات و تەقلیدی ڕۆژهەڵات بکەن! ڕۆژهەڵاتنناسی هەر چیەك بێ، بزاڤ یان کۆمەڵە بێ، دیتنی ڕۆژئاوایە بۆ ڕۆژهەڵات ! ئەو دیتنە تەنها پیاوی ڕۆژئاوایی لە بارەی ڕۆژهەڵاتەوە هەیەتی ! دەبێ بابای ڕۆژهەڵاتنناس، ڕۆژئاوایی بێ.ڕۆژئاواناسی، دیتنی ڕۆژئاوا بە چاوی ڕۆژهەڵاتیەك، لە لایەك جگە لە گومان و سوکایەتی، لەلایەکی دی جگە لە ئیعجاب و خۆ بە

کەمزانین مەبەستر نییە !! هیچ ڕۆژهەلاتیەك، بە تایبەتی کورد، نەهاتووە کتێبێك دەربارەی ئاین و زمان و دابونەریتی ڕۆژئاواییەکان بنووسێت !! تاکو بزانێت تاکی ڕۆژئاوایی چۆن دەژی ؟ تاکی ئەوێ ئاینپەروەرە یان سیکیولەرە ؟؟ ئەو تاکانە باوەڕیان بە ئاینی ڕۆژهەلاتی، بە تایبەتی ئیسلام و ئەدەبی ڕۆژهەلاتی چییە ؟ چونکە مەعقول نییە تەوراتی یەهودی، ئینجیلی نەسرانی ڕاست بن، کەچی قورئان ڕاست نەبێت ؟ بۆچی هەوالی ئاسمان و زەوی لە یەهودی و نەسرانیەت کورتبکرێتەوە، موسلمانەکان لە مەدا بێبەشبکرێن ؟ ئایا ئەمە برەودان بە غەدری ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەلات نییە ؟ تاکی سیکولەری کورد بۆ نموونە لەو غەدرە ناگات: لە ئەدەبی کلاسیکی کوردی، کە زۆری بە دەست مەلای کورد نووسراوە، تا ڕادەیەکی زۆر پەسنی پێغەمبەری ئیسلام کراوە، کەچی لە زۆربەی ئەدەبی نوێی کوردیدا ئەوەندەی باسی مەسیحی نێو ئینجیل کراوە لە ڕۆمان و شیعری کوردیدا، ئەوەندە باسی پێغەمبەری ئیسلام نەکراوە ! لە پرۆسەی تواناسازیدا پارەیەکی بێ شومار لە بودجەی هەرێم تەرخانکراوە بۆ شەهادە وەرگرتنی کورد لە ڕۆژئاوا، کەچی دینارێکیش تەرخاننەکراوە بۆ پرۆسەی ڕۆژئاواناسی، هەتا توێژەری کورد لە سنووری ئیعجاب و

ئینبهار بە ڕۆژئاوا دەرچی، و توێژینەوەیەك دەربارەی باوەڕی تاکی ڕۆژئاوا بە میسۆلۆژیا و باوەڕی تاکی ڕۆژئاوا شرۆڤە بکات! ئەوە خۆی کوشتنی مەعریفەیە، چۆن تاکی عەرەب لە مێژە لە نێو تەلیسمی جەهلْ دەژی، فریای ئەوە ناکەوێ خۆی ڕوئیای هەبێ بەرانبەر تاکی ڕۆژئاوایی یان هەر تاکی ئەوێ بناسێ وەك مەعریفەیەك!

لەپاشان ئێینە سەر ماهیەتی ڕۆژهەڵاتناسەکان کە چۆن وەسفی کوردیان کردووە؟؟ ڕۆژهەڵاتناسەکان باسی ئایینی کۆنی کورد و ئەو ئایینانەی کوردیان، کە لە بنەڕەتدا لە ئیسلام جیابوونەوە، دەکات بە مەبەستی ئەوەی تاکو کورد و ئیسلام لە یەکجیابکەنەوە! دەربارەی ژێدەری ڕۆژهەڵاتناسەکان نووسەرێکی کوردی سیکولار بە ژمارە دەربارەی ناسنامەی ڕۆژهەڵاتنناسەکان دەنووسێ، کە زۆربەی سیخوری حکومەت و کەنیسای ڕۆژئاواین، تەنها کەمێکیان بۆ توێژینەوە هاتوونە کوردستان.

ڕۆژهەڵاتناسەکان لە بارەی چەند مەسەلەی وەك: ژێدەری سروشی قورئان، دەقی قورئان و کتێبی ئینجیل، دروستی دەقی قورئان، مەعصوم بوونی دەقی قورئان، هەروەها نووسینەوەی

قورئان یان نه‌خوێنه‌ده‌واری پێغه‌مبه‌ر.... ده‌وروژێنن.له‌ باشووری کوردستان ئه‌و مه‌سه‌لانه، سیکوله‌ری کورد، ته‌نیا به‌ زمانی کوردی ئه‌و پرسانه‌ کاوێژ ده‌کاته‌وه!

له‌ ده‌سپێکدا ده‌مه‌وێ باسی کێشه‌ی سه‌ره‌کی ئه‌و که‌سانه‌ بکه‌م، که‌ ته‌واو له‌ هه‌قیقه‌ته‌تی خاوه‌ن ده‌قی قورئان، که‌ خودایه، نه‌گه‌یشتوون، بکۆڵینه‌وه.

## + سیما و ئه‌دگاری خودا

جارێ "سیما " مه‌سه‌له‌ی هه‌بوون یان نه‌بوونی " سیما و شێوه‌ی خودا " نییه، به‌لکو ته‌نیا واتای هه‌بوونی چه‌ند سیفه‌تێکه‌ له‌ زاتی خودا، که‌ له‌ به‌نی ئاده‌م دا نییه.هه‌ر له‌ ڕێگای ئه‌و سیفه‌تانه‌وه‌ له‌ خودا نزیکده‌بینه‌وه، نه‌ك قسه‌ کردن له‌ سه‌ر زاتی خودا، چونکه‌ سیۆلۆژی"خودازانی " له‌ قورئان بوونی نییه، ته‌نها ده‌رهاوێشته‌ی عه‌قڵی مرۆڤه، بۆیه‌ ئه‌وانه‌ی به‌ چاوی سیۆلۆژی له‌ زاتی خوا ده‌ڕوانن، ئه‌وه‌ هه‌ندێ لێیده‌کۆڵنه‌وه‌ هه‌ر گومڕابوون د هه‌ڵکشان به‌ره‌و لاڕێبوونی لێده‌که‌ته‌وه!!

به‌ر له‌وه‌ی باسی ڕوانگه‌ی خۆمان وه‌کو موسلمان به‌رانبه‌ر زاتی خودا بکه‌ین، که‌ باوه‌ڕێکی ڕه‌هایه‌ به‌و زاته، ئه‌وا هه‌وڵ ده‌ده‌ین

وەکو زانستکارێك قسە لە سەر فەلسەفەی بوونی زاتی خودا لە زاتی ئافراندنی مرۆڤ بکەین. هەوڵ و پێکۆڵمان بۆ ئەوەیە فەلسەفەی زاتی خودا لە ژێدەری دروست شرۆڤە بکەین، نەك زاتی خودا لە ئەفسانە و ژێدەری نا خودایی بدۆزینەوە!! لە ئەو ئەفسانە و ژێدەرە نا-خوداییانە، زاتی خودای هەقیقی نادۆزینەوە، بەلکو "خودا"یەکی ناو ئەفسانە و کتێب و فەلسەفە بەرچاو دەکەوێ، ئەمەش بە هیچ جۆرێ خودای هەقیقی نییە.

قسەکردن لە زاتی خودا لە دەرەوەی توانای مرۆڤە! ئێمە باس لە خودا لە سەر بنیاتی قورئان و فەرموودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام دەکەین. هەرچی لە ئایینە نیمچەئاسمانیی و دەستکردەکان باسی خودا کراوە، ئەوا ئێمە زۆربەی زۆریان دەخەینە دیتنی مرۆڤەوە، خودا لەو پێناسانەوە لە زاتی خوداوە دوورە. هەروەك چۆن لە هەندێ ئەو ئایینانەوە ئەوەی پێی دەوترێت " یەزداننناسی، خوداناسی، لاهوت، سیۆلۆجی... " خودا پێناسە دەکەن، نەك ئەو خودایەی " هاوشێوەی نییە " وێڕای ئەوەش، ئەو کەسانە دوورن لەوانەی تەواو لە زاتی خودا گەیشتوون، یان وەك خودا خۆی دەفەرموێ: " ئەوانە تەواو قەدری خودا نازانن "، بۆیە وا گومڕا و سەرلێشێواون.

# جیاوازی گوتاری قورئان گەڵ ئایینەکانی تر

لە ئیسلامدا زیاتر سیما و ئەدگار و ناوی پیرۆزی خودا ئامادەبوونی هەیە. خودا لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ " کەس وەکو ئەو نییە " بۆیە ناتوانین وەکو مرۆڤ وێنای خودا لە زەینی خۆمان بکەین !! ئەمە زۆر ئاساییە، چونکە زۆر شتی دەستکردی مرۆڤ وەکو کارەبا، ڕەنگ، فاکس....هتد وێناناکرێ لە زەینی مرۆڤدا ! بۆیە دەقی قورئان وا لە موسلمانەکان دەکات، کە بیر لە زاتی خودا نەکەینەوە، بەڵکو بیر لە سیما و ئەدگار و ناوە پیرۆزەکانی خودا بکەینەوە !! بە واتایەکی دی لەو ڕێگایانەوە لە زاتی خودا نزیك ببینەوە.

هەندێ لە سیکولاریزمی کوردی هەندێ گفتوگۆی هزری لە بارەی زاتی خوداوە تاوتوێ دەکەن. لە لایەك بە ئاشکرا دەڵێن: "قورئان کەلامی ئەبەدی خودا " نییە یان " خودا لە سەری مرۆڤدا " یان " قورئان مەعصوم نییە " یان " خودا.. قورئان..کامیان سەرچاوەی حەقیقەتە ؟ "لەو کتێبانە، نەك هەر زاتی خودا بە مرۆڤ نانێسێنن، بەڵکو ڕەخنە و قسە بە زاتی خودا دەڵێن !!! لە ئیسلامدا ئاساییە ڕەخنە لە بەرنامەی ئیسلام بگیرێت، ئەوا زانایانی ئیسلامن

وەڵامی ئەو ڕەخنانە دەدەنەوە. لە ئیسلامدا ئەوەی ئاسایی نییە قسەکردنە بە زاری خودا و پێغەمبەر ! یان تەئویلکردنی، نەك تەفسیرکردنی هەندێ دەقی قورئانە !

ئێمەی مرۆڤ زۆر قەرزاری جەستەیی و کۆمەڵایەتی و ئابووری....زاتی خوداین، بەڵام (فیۆرباخ) ئەو ڕاستیەی لە گەڵ خاوەنی"پێشەکی خودا لە سەری مرۆڤدا " یەکناگرێتەوە "ئەوە خودا نییە مرۆڤی دروست کردووە، بەلکو ئەوە مرۆڤە خودای دروست کردووە "!! مارکسیەکانی کوردستان وەختی خۆی زۆرجار ئەو قسەیەی(فیۆرباخ) -یان بە نموونە دەهێنایەوە، هەتا(لینین) خۆی ئەمەی بە نموونە دەهێنایەوە!! ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە (فیۆرباخ)و(لینین) لە زاتی خودا و مرۆڤ نەگەیشتوون ؟؟!! یان بە ڕوانگەیەکی ئوستورەیی لە زاتی خودا گەیشتوون! یان هەوڵیان نەداوە شوێن پەنجەی خودا لە خۆیان بدۆزنەوە.

ئێمە وەکو موسلمان دەرك بە زاتی خودا ناکەین، بەڵام زاتی خودا دەرك بە ئێمەی مرۆڤ دەکات. ئەوە گوتاری ڕەوان و ئاشکرای قورئانە. ئەوانەی ڕەخنە لە بوونی زاتی خودا دەگرن، هێندە هەوڵی ڕۆحی و دەروونیان نەداوە دەرك بە سیما و ناوەکانی خودا لە ناو

ده‌قه‌كانی قورئانی پیرۆز بكه‌ن، ئه‌گه‌رنا سیما و ناوه‌كانی خودا له‌ ئافراندنی زاتی خۆیان ده‌رك پێده‌كه‌ن! بۆیه‌ به‌ كورتی بۆ ناساندنی زاتی خودا له‌ ده‌قی قورئاندا، پێویسته‌ له‌ ڕێگای قورئان و سوونه‌، له‌ ئه‌دگار و ناوه‌كانی خودا نزیك ببینه‌وه‌ له‌ زاتی خودا، نه‌ك بیركردنه‌وه‌ له‌ خودا.كه‌ هه‌ندێ ڕه‌خنه‌ له‌ قورئان ده‌گرن، یان ئه‌وه‌ته‌ له‌ قورئان ناگه‌ن یان به‌ زاری خودا قسه‌ ده‌كه‌ن یان ته‌ئویلی هه‌ندێ ئایه‌تی قورئان ده‌كه‌ن، به‌ تایبه‌تی ئه‌وه‌ی ڕه‌صافی‌و خاوه‌نی كتێبی" خودا..قورئان..كامیان....." ده‌كه‌ن. بۆ نموونه‌ كه‌ خودا ده‌فه‌رمووێ: ئه‌گه‌ر ناتووانن وه‌كو ئه‌و قورئانه‌ بهێنن، ئه‌وا ته‌نیا سوره‌تێك بهێنن " كه‌چی ئه‌وان ده‌نووسن: ئه‌گه‌ر ناتوانن سوره‌تێك بهێنن، یان (ده‌) سوره‌ت بهێنن، ئه‌وا وه‌كو ئه‌و قورئانه‌ بهێنن ؟ ئه‌و بۆچوونه‌ی ئه‌وان دووره‌ له‌ عه‌قڵ و هزری سه‌لیم، چونكه‌ هیچ لۆژیكێك ئه‌وه‌ قه‌بوڵ ناكات، كه‌ كه‌سێك شتێكی قه‌باره‌ گه‌وره‌ بێنێ وه‌كو هه‌موو قورئان، ئه‌گه‌ر پێینه‌كرا، دیاره‌ پێیناكرێ جا هه‌ر هیچ نه‌بێت ته‌نیا سوره‌تێك بهێنێ! ! هیچ لۆژیكێك قه‌بوڵی ناكات ئه‌وه‌ی سوره‌تێكی وه‌كو قورئانی پێنه‌هێت، چۆن هه‌موو قورئانی پێده‌هێت؟

# ئاریشەی بیرۆکەی د. سروش

لەم بەشە هەوڵدەدەیین کتێبەکە بە شێوەی ئەکادیمی دابڕێژین، چونکە بابەتەکە وا دەخوازێت لە سەری بدوێین. هەرچەندە بەبێ پێویست نەبێ، وەك لە نووسینی ئەکادیمی هەیە، ئامـاژە بە زێدەری سەرچاوەکە ناکەین بۆ ئەوەی خوێنەر وڕس نەکەین هەروەها دەربارەی میتۆدی نامەکەش دەڵێین میتۆدەکە لە سەر هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی عەبولکەریم سروش و وەرگێرەکەی دامەزراوە!!

## سیکیولەرێکی فارس و دەقی قورئان

## ئاریشەی بیرۆکەی (سروش)

بیرۆکەی سروش دەربارەی زاتی خودا و قورئان وەك دەقێکی ئیلاهی کەم و زۆر کاریگەری هەیە ! جا ئەو کەسانە لە دەرەوەی بازنەی ئایین بن یان بە ناو لە چوارچێوەی ئایین دابن، گرینگ نییە چونکە هەندێ کتێب و وتاری سروش لە میدیای کوردی وەڵامی ئەو بۆچوونەی سەرەوە دەدەنەوە. وێرای ئەوەش، وتارەکانی سروش ئەوەندە بە " بوێری " نووسراون، کە کۆمەڵگای تەقلیدی کوردی قەبوڵی ناکات، بۆ نموونە لە دیدارێکدا لە گەڵ گۆڤارێکی هۆلەندیدا بە ڕاشکاوی دەڵێت: " قورئان بەرهەمی بیرکردنەوەی موحەمەدە

"هەروەها وەك هەندێ ڕۆژهەڵاتناس، سروش باوەڕی بەوە نییە کە وەحی قورئان وەحی کەلامی بێ لە نێوان خودا و پێغەمبەر، بەلکو ئیلهامی خودی پێغەمبەرە!

+ئامانجی لێکۆڵینەوەکە

توێژینەوەکە چەند ئامانجێکی هەیە :

١. دیارخستنی بیرۆکەی (د. سروش).

٢. دیارخستنی مەزهەبی سروش و قسەکردن لە سەر کاریگەری ئەو مەزهەبە لە سەر فۆرمەلەکردنی هزری سروش.

٣. هەڵوەشاندنەوەی بیرۆکەی سروش.

٤. قسەکردن لە سەر ئەو کەسەی کاریگەر بووە بەو بیرۆکەیە.

+گریمانەکانی لیکۆڵینەوەکە

نووسەری بیرۆکەکە-سروش و وەرگێرەکەی کە ئەحمەد قەبەنچییە- چەند گریمانێك بۆ بیرۆکەکە دەکەن :

١. هەر دوو لا گریمانی ئەوە دەکەن لە چوارچێوەی ئیسلام دەرنەچوون، ناو لە خۆیان دەنێن " مفەکری ئیسلامی ".

٢. ئەوان دەڵێن ئەگەر ئیسلام دەیەوێت " لە ڕەوڕەوەی مێژوو زانست " دوا نەکەوێت، دەبێ ئیسلامێکی مەدەنی و لیبرالی بێت.

٣. ئەوان لە ئیسلامی تەقلیدی دەرچوون و خەریکی ئیسلامێکی مەدەنیین.

+سنووری بابەتەکە

بۆ ئەوەی زۆر لە بابەتەکە دوور نەکەوینەوە، نووسینەکەمان وەك دەڵێن عەرش و قورش لە خۆ نەگرێ تەنیا قسە لە سەر گریمانانە دەکەین، کە لە سەرەوە ئامارژەمان پێداوە............

+گرینگی و بەهای بابەتەکە

بۆ کێ گرینگە ؟؟ بە ڕاستی ئەم نووسینە بۆ ئەوانە گرینگە لە بواری بیرۆکەکە کار دەکەن. وەك گوتمان کاریگەری بیرۆکە لە باشووری کوردستان هەیە، جا گرینگە ئەوەی نوێ لە ئیسلامی ئیلاهی و ئیسلامی مرۆڤکردە تێبگات، نەك بە ناوی فەلسەفە و بیری ئازاد لە پەرپەرەی مێژوو بکەوێ و بچێتە زبڵدانی مێژووەوە وەك ئەو دوو " بیرمەندە نا-ئیسلامیە.........."

## ناساندنی ئەو دوو بیرمەندە

سروش و قەبانچی لە میدیای کوردیدا حزووریان هەیە، بە تایبەتی کەسێکی وەك سروش وەك بیرمەندێکی ئیسلامی دەناسرێت !ئەوەی لێرەدا جەختی لە سەر دەکرێت دەقی بەرانبەری قسەکانیەتی. ئەوەی سروش و قەبانچی دەیلێن قسانێکە لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامیە، بۆیە گرینگە لەلەبی بیرمەندی ئیسلامی لە دوای ناوەکەی خۆیان لابەن!

سروش یان عەبدلکەریم سروش ناوی ڕەسەنی سروش نییە، چونکە بۆنی ناوی کوردی وشییعەی لێدێت.ناوی تەواوی خۆی (حەسەن حاجی فەرەج دەباغە)! چ مەسەلەی کوردبوون لە ڕووی نەتەوەوە و شیعەبوون لە ڕووی مەزهەبەوە بێ، لە لایەن فارس و عەرەبەکانەوە بە تایبەتی ئەوانەی لە گەڵ ئەو دژە قەوم و مەزهەب بن ناوبانگەکەی لەکەدار دەکەن!!

ئەوەی سروش دەربارەی یان دژی بنەماکانی ئیسلام نووسیویەتی لە قسەی ئەرەگۆن و عەلی حەرب و ناصر ئەبو زێد زیاتر نییە، هەرچەندە ئەو بە ناو بیرمەندی ئیسلامیە و ئەوانی تر سیکیۆلەرن ! سروش کە دەڵێت: بێجگە لەو ئایاتەنەی باس لە پەرستن و تقوسی دی ئیمانی دەکەن، ئەوانی تر زادەی بیری موحەمەدن!" چەندەها ئایەت هەن وەك دەقێك ئەو گریمان و بیرۆکەی سروش ڕەتدەکەنەوە: " هیچ پێغەمبەرێك ڕێ ی پێنادرێ ئایەتێك بەبێ پرسی خودا بێنن " کەواتە سروش ئەم ڕایەی جگە لە زەن و گومان زیاتر نییە.سروش جگە لەوەی یەکێ لە پیاوەکانی دەسەڵاتی ئێرانە ئەوە لە ڕێگەی بەرەی ڕیفۆرمەوە داکۆکی لە دەسەڵاتی ئێرانی دەکات !کێشەی سەرەکی هەبوونی سروش ئەو

باکگراوەندەتی بەوەی لە ڕۆژئاوا دکتۆرای لە بواری کیمیا وەرگرتووە، ئەمەش بۆ کۆمەڵگای فارسی و کوردی زۆرە!!

قەبانچی بەرگەکەی و بیرۆکەکەی بەرگی زانای ئایینی شیعە و بیرۆکەی زانای شیعیە دەربارەی قورئان ! ئەو جگە لەوەی لە نەجەف عیراقی و قومی ئێرانی شیعەگەری خوێندووە، ئەوا هەرچی دەربارەی قورئان دەیڵێت دەرهاویشتەی ئەو دوو شوێنەیە. وێڕای ئەوەی قسەی زۆر نا–لۆژیکی دەڵێت، بەلام هەر بیرمەندی ئیسلامی وەك پاشکۆیەك بە کاردێنێت. بە واتای ئەوەی ئەو دەیڵێت شتێکی نوێیە، بەلام لە ناسینی خودادا دەشتەکیەکی نەخوێندەوار لەو زیرەکترە ! ئەو باوەڕی وایە دوو خودا هەیە: خودای ڕەها کە سیفەتی دروستکاری هەیە، وێنەی خودا، خودای کەسیە، ئەمە هەروەها پێی دەوترێت خودای ویژدان، کە ئەو خوایە ئیلهامی بۆ موحەمەد هەناردووە !! جگە لەوەی هیچ بەڵگەیەك بۆ ئەو دووە ناهێنێتەوە ! ئەم جۆرە دالغەیە قسەی ڕۆژهەلاتنناسەکانمان وەبیردەهێنێتەوە، کە لە لای ئەوان خودا، خودای دەروونیە ! یان وەك مارکسیەکان " خودا بوونێکی ئایدیالیستی مرۆڤکردەیە " " دەرهاوێشتەی زەنی میتافیزیکیە "، بەڵگەی ئەوەی تەنیا یەك خودا هەیە ئەوا دەقی قورئان پڕیەتی لە یەکخوایی بە جۆرێك

هەموو پێغەمبەرەکانی پێش موحەمەد پێغەمبەریش لە گەڵ موحەمەد پێغەمبەر هاوکۆك بوونە کاری سەرەکیان بۆ لە سەربوونی یەکخوایی کردووە.

با سروش لە ڕێگای شرۆڤەکردنی کتێبەکانیەوە بناسین.لەو کتێب و دیدارانە، دیدی سروش بە پێوەری قورئان چۆنە ؟ ئایا ئەو ڕایانە لە هزرمەندی ئیسلامی دەوەشێتەوە ؟ ئایا ئەو کەسەی باوەڕی وا بێت، کە قورئان دەرهاوێشتەی سەردەمی خۆیەتی، لە کوێی چوارچێوەی موسلمانبوون جێی دەبێتەوە؟

# قسه له‌سه‌ر یه‌که‌م کتێبی عبدلکه‌ریم سروش

# پلورالیزمی ئاینی

با له ده‌سپێکه‌وه ئه‌وه ڕوونبکه‌مه‌وه، که مه‌به‌ست له یه‌که‌م کتێبی سروش، یه‌که‌م کتێبه سه‌باره‌ت به توێژینه‌که‌مانه‌وه، نه‌ك یه‌که‌م کتێبی نووسه‌ره –سروشه!

جارێ ئه‌م کتێبه‌ی سروش وا ده‌رده‌خات، که سروش له ده‌ره‌وه‌ی بازنه‌ی ئیسلامبوون ده‌رناچێت ! کتێبه‌که ڕه‌خنه به هه‌موو جۆره‌کانیه‌وه له قورئان ناگرێت. به هیچ جۆرێ ئه‌م کتێبه باس له مه‌سه‌له عه‌قیده‌یه‌کان ناکات، به‌لکو له سه‌ر ڕای خه‌ڵك ده‌دوێ، که فره خوێندنه‌وه‌یان بۆ ده‌قی قورئان داهێناوه، بۆ نموونه هیچ ده‌قێکی قورئان باس له مێژووی ده‌رکه‌وتنی سوونه و شیعه ناکات، ئه‌وه مرۆڤه ئه‌و ناوانه‌ی داهێناوه!

ناونیشانی کتێبه‌که پێشنیازی شتێك ده‌کات، که به هیچ شێوه‌یه‌ك له قورئاندا بوونی نییه یان ئاماژه‌یه‌ك به بوونیان ناکرێت.پلورالیزم به واتای له یه‌ك زیاتر دێت، به واتای فره دێت، به واتای کۆ دێت. به گشتی پلورالیزمی ئاینی به واتای فره ئاین، کۆ ئاین، زیاتر له ئاینێك زیاتر له خوێندنه‌وه‌یه‌ك ! !ده‌گه‌یه‌نێت،

به‌لام ناوه‌ڕۆکی کتێبه‌که ئه‌وها نالێت، به‌لکو له لای ئه‌و پلورالیزمی ئایینی تێگه‌یشتن له ئایینه، نه‌ك ده‌قی ئایینی ! لێره‌وه کۆ ده‌نگێك له سه‌ر ئایین دروست ده‌بێت. هه‌ر له سه‌ده‌کانی زووه‌وه شیعه و سوونه دروست بوون، بیجگه له نێو سوونه‌دا چه‌نده‌ها خوێندنه‌وه بۆ چه‌مکی ئایین کراوه و خۆیان به به‌شێك له ئیسلام زانیووه. له‌مه‌زیاتر، کرێکار وته‌نی ته‌نها له نێو سه‌له‌فیه‌ت چوار سه‌له‌ف هه‌ن!!

ئه‌مانه خوێندنه‌وه‌ن بۆ ئایین ! له نێو شیعه چه‌نده‌ها گروپ هه‌ن هه‌ندێ توندڕه‌و وهه‌ندێ میانڕه‌و ! هه‌موو خوێندنه‌وه یان دیتنن بۆ ئایین!!

کتێبه‌که‌ی سروش له سه‌ر تێگه‌یشتنی ئایینیه که له مێژووی ئیسلامدا به فره تێگه‌یشتن ده‌رکه‌تووه، بۆیه سروش ناویلێناوه "پلۆرالیزمی ئایینی "، که به ڕاستی ده‌بووایه کتێبه‌که‌ی سروش ناوی " پلورالیزمی تێگه‌یشتنی ئایینی " بووایه. ئێمه له کتێبه باس له‌و دیارده ناکه‌ین و له هۆیه‌کانی سه‌رهه‌ڵدانی ئه‌و دیارده‌یه ناکۆڵینه‌وه، ئه‌گه‌رچی خۆمان باوه‌ڕمان وایه ئه‌و دیارده‌یه ته‌ندروست نییه و هیچ ده‌قێکی قورئان نییه جه‌خت له سه‌ر

تەندروستبوونی پلورالیزمی ئاینی بکات، جا مەبەست لێی فرەئاینی بێت یان تێگەیشتنی فرەئاینی ؟!

بۆ ئەوەی لە سنوری توێژینەوەکە دوور نەکەوینەوە، بە باشی دەزانین یەکسەر بێینە سەر خودی بابەتەکە.

وەك لە سەرەتا وتم لەم کتێبەدا سروش باسی باوەڕی خۆی ناکات کە لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامە یان سیکولەرێکی شیعەگەرە!

وەرگێڕی کوردی کتێبەکە لە چەند شوێنێك ئاماژە بەوە دەکات کە وەرگێڕانی کتێبەکە واتای ئەوە نییە کە وەرگێر لەگەڵ هەموو ڕایەکانی نووسەر-سروش- دایە!

لە لاپەڕە ٢٤ دەنووسێ "ئەمڕۆ پلورالیزمی زیاتر لە سەر دوو بناخە دامەزراوە: یەکەم تێگەیشتنی ئێمە لە دەقی ئاین و دووەم ڕاڤەکانی ئێمە بۆ ئاین " سروش بە ناڕاستەخۆ دان بەوە دەنێت دەقی ئاین خودی خۆی پلورالیزمی نییە و ئێمەی مرۆڤ وا مان لێکردووە بە تێگەیشتن و تأویل خۆمان بیکەینە پلورەل ! ئاین خۆی وەك دەقێك، نەك ئەوەی هەندێ مرۆڤ دەیانەوێ ئەو پلوڕەلەی مرۆڤ دەیەوێ ڕێگەیەکە لە دەرچوون لە بازنەی

تەندروستبوونی پلورالیزمی ئایینی بکات، جا مەبەست لێی فرەئایینی بێت یان تێگەیشتنی فرەئایینی ؟!

بۆ ئەوەی لە سنوری توێژینەوەکە دوور نەکەوینەوە، بە باشی دەزانین یەکسەر بێینە سەر خودی بابەتەکە.

وەك لە سەرەتا وتم لەم کتێبەدا سروش باسی باوەڕی خۆی ناکات کە لە دەرەوەی بازنەی ئیسلامە یان سیکولەرێکی شیعەگەرە!

وەرگێڕی کوردی کتێبەکە لە چەند شوێنێك ئاماژە بەوە دەکات کە وەرگێڕانی کتێبەکە واتای ئەوە نییە کە وەرگێڕ لە گەڵ هەموو ڕایەکانی نووسەر–سروش– دایە!

لە لاپەڕە ٢٤ دەنووسێ "ئەمڕۆ پلورالیزمی زیاتر لە سەر دوو بناغە دامەزراوە: یەکەم تێگەیشتنی ئێمە لە دەقی ئایین و دووەم ڕاڤەکانی ئێمە بۆ ئایین " سروش بە ناڕاستەخۆ دان بەوە دەنێت دەقی ئایین خودی خۆی پلورالیزمی نییە و ئێمەی مرۆڤ وا مان لێکردووە بە تێگەیشتن و تأویل خۆمان بیکەینە پلورەل ! ئایین خۆی وەك دەقێك، نەك ئەوەی هەندێ مرۆڤ دەیانەوێ ئەو پلورەلەی مرۆڤ دەیەوێ ڕێکەیەکە لە دەرچوون لە بازنەی

ئایینەوە، چونکە ئایینی ئیسلام جەخت لە سەر یەکخوایی دەکات نەک پاکی بۆ خودا، چەندخوایی !

لە لاپەڕە ٢٧ سروش دەنووسێت: "ئیسلامی سوننی تێگەیشتنێکە لە ئیسلام و ئیسلامی شیعەش تێگەشتنێکی دیکەیە. ئەوانەش هەموو سروشتییە و فەرمین." ئەوەی ناسراوە بە سوننی ئێستا لە بانگەشەکردن بۆ ئیسلامەتی، بەشێکی کار بۆ عەرەبایەتی دەکات و لە هەمان کاتدا بۆیەکی ئایینی لێدەدات بۆ ئەوەی بەرانبەرەکەی دەستەوەسان بکات تا وابزانێ ئەو عەرەبە سوننیە شەڕی ئایینیی لەگەڵ دەکات !! ئەو گروپە لە وڵاتی عەرەبی زۆرن و لە بنەڕەتدا شەڕ لەگەڵ قورئان دەکەن ! لە وڵاتێکی وەکو عێراقدا عەرەبی سوننە بە ناوی ئایینەوە شەڕ لەگەڵ کورد دەکەن و ئێستاش باوەڕیان بەوەیە وەکو سەردەمی سەدام بە تەواوی حوکمڕانی باشووری کوردستان بکەن.بەشێکی زۆر لەو عەرەبانە دوور و نزیک بە هیچ جۆرێ کار بۆ سوننەبوون ناکەن...ئیسلامی سوننە لە ڕێگای تێگەیشتنی جیاوازیان لە دەقی قورئانەوە دروست نەبوون، بەلکو هۆکاری سیاسی دروستی کردوون، کورد لە ژێر ئاڵای ئەو سوننە سیاسیەدا لە سەردەمی پاشایەتی عیراق ١٩٢١– هەتا سەردەمی صدام ١٩٦٨–٢٠٠٣ ڕووبارێک خوێنی داوە.

هه‌رچی ئیسلامی شیعه‌یه ئه‌وه له ڕێگای شۆڕشی ئێرانه‌وه ده‌سه‌ڵاتێکی روحی و سیاسیان له سوریا و عێراق و لوبنان و پاکستان په‌یداکرد.ئێستاش له سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه عه‌ره‌بی شیعه‌ی عێراق و ده‌وڵه‌تی ئێران و شیعه‌کانی لوبنان پشتیوانی نه‌بڕاوه له ده‌سه‌ڵاتی سوریا ده‌که‌ن! !شیعه خۆی له ئه‌نجامی تێگه‌یشتنێکی جیاواز له ده‌قی قورئان دروستنه‌بوون، به‌لکو شانازی به مێژووی دێرین، شیعه‌ی دروستکرد، ده‌سه‌ڵاتی شیعه له عیراق ناسیۆنالیزمێکی مه‌زهه‌بی پیاده ده‌کات، هه‌رکه ده‌سه‌ڵاتی موتله‌قی هه‌بێت، به ناوی دین هه‌ژموونی عه‌ره‌بایه‌تی به سه‌ر کورد تاقی ده‌کاته‌وه، به‌وه‌ش خزمه‌تێك به سیکیوله‌ری کورد ده‌کات: کورد هانده‌درێت که زیاتر له ئیسلام دوور بکه‌وێته‌وه، وه‌ك هه‌ندێ کوردی ڕۆژهه‌ڵات!

ئیسلامی سوننه و شیعه نه پرۆسه‌یه‌کی سروشتیین و وه نه فه‌رمیین سه‌باره‌ت به قورئانه‌وه، ئه‌وه‌نده‌ی هه‌وڵن بۆ لاوازکردنی ئیسلام هێنده کار بۆ به‌هێزکردنی ئیسلام ناکه‌ن. ئگه‌ر مه‌سه‌له‌که، ئاییني ڕه‌سمی ولات بێ، ئه‌وا له هه‌موو ده‌وڵه‌تێکی عه‌ره‌بی ئیسلامی: سوننه ئاییني فه‌رمی ولاته و له ئێرانیش ئیسلامی شیعه ئاییني فه‌رمی ئێرانه. له‌و ولاته عه‌ره‌بیانه ئه‌وانه‌ی له زیندانن له

سه‌دا ٩٥٪ ئیسلامی نیین؟؟ له‌ ئێرانیش ٩٥ ٪ كورد و ئیسلامی نیین ؟؟ له‌ لایه‌كی دی ئه‌و دابه‌شبوونه‌ی سوننه‌ و شیعه‌ له‌ قورئانیان دروستكردووه‌، دووره‌ له‌ ده‌قی قورئان !وه‌ك گوتمان ئه‌و دابه‌شبوونه‌ وه‌ك دابه‌شبوونی سایكس-بیكۆیه‌، ئه‌وه‌نده‌ هه‌یه‌ سایكس -بیكۆ سیاسیه‌، سوننه‌ و شیعه‌ دابه‌شكردنێكی مه‌زهه‌بی ئیسلامه‌، كه‌واته‌ هه‌ردووكیان ئه‌وه‌نده‌ی زه‌ره‌ریان بۆ ئیسلام هه‌یه‌ قازانجیان نییه‌!!

له‌ لاپه‌ڕه‌ ٣١ ده‌نووسێت: " سۆفییه‌كان ئه‌م ئه‌زموونه‌یان به‌ وه‌حی حه‌ق داناوه‌ و به‌ شتێكی كه‌متریان له‌ وه‌حی نه‌زانیوه‌ و ناویان ناوه‌ وه‌حی دڵ.هه‌مووی وه‌حییه‌." وه‌ نه‌بێ ئێمه‌ باوه‌ڕمان به‌ هه‌بوونی سۆفیگه‌ری نه‌بێ، به‌ تایبه‌تی سۆفیگه‌ری دروست. مرۆڤێك باوه‌ڕی به‌ پاككردنه‌وه‌ی ده‌روون هه‌بێ، ئه‌وه‌ هه‌وڵدانێكه‌ بۆ به‌ره‌و خودا چوون.هه‌رچی وه‌حی حه‌قبوونه‌ ئه‌وه‌ ته‌نیا بۆ پێغه‌مبه‌رانه‌ _ له‌و جۆره‌ وه‌حیه‌دا فه‌رمان و پێگیربوون بوونی هه‌یه‌، به‌ڵام وه‌حی بۆ هاتن وه‌ك وه‌حی هاتن بۆ دایكی موسا پێغه‌مبه‌ر و حه‌زره‌تی مه‌ریه‌م وه‌ك وه‌حی پێغه‌مبه‌رایه‌تی نییه‌ ئه‌وه‌ته‌ قورئان هه‌ر خۆی پێمانده‌ڵێ وه‌حی پێغه‌مبه‌رایه‌تی ته‌نیا بۆ پیاوانه‌، نه‌ك ژنان. وه‌حی دڵ یان وه‌حی ده‌روون چه‌مكێكه‌ زیاتر

هەندێ پڕژهەلاتنناس دژە بنەماکانی ئیسلام بە کاری دەهێنن. وا گریمان و بانگەشە دەکەن کە زاتی خودا لە هەر ئاییینێك و بونەوەر دەدۆزنەوە. ئەمانە هەموو قسەن ، ئەگەرنا زاتی خودا تەنیا لە بونەوەری بینراو و قورئانی نووسراو...دەدۆزرێتەوە، نەك بوزی بی و خەریکی بتپەرستی بی.لە ئەزەر سروش و فەیلەسوف ئەستیس بوزاییەکان ئەزموونی خواییان هەیە و زۆرجار بووە کە کەسێك بتپەرستیش بیٚ شتێك بدۆزێتەوە، بەلام نەزانێت چی دۆزیوەتەوە؟ هەمان لاپەڕە.لە مەسەلە باوەڕیەکان، تەنیا لە مەسەلەی ڕێنمونکردنی خودایی بۆ ئەو کەسە نە بیٚ ئەو بۆ باوەڕکردن بۆ هەبوونی خودا هەنگاو بنێت، ئەگەرنا وروژاندنی ئەو خاڵە بۆ ئەوەیە کە هەبوونی قورئان هەر ژمارەیە و پلورالیزمی ئاییینی بوونی هەیە.

سروش جورئەتی ئەوە دەکات بڵێت زاتی خودا خۆی پلورالیزمی لە تێروانینی ئاییینەوە دامێناوە.لە لاپەڕە ٣٦ دەنووسێت: " یەکەم کەس کە تۆوی پلورالیزمی چاند، لە جیهان خودی خوا خۆی بوو......" دیسان ئەگەر پلورالیزم مەبەستی فرە بیٚ، ئەوا خوا بۆ هەموو پێغەمبەرە جیاوازەکان هەر یەك زاتی خودایە، داواشی لەو پێغەمبەرانە کردووە یەکخوایی لە ناو خەڵکدا بڵاوبکەنەوە. ئەو

پێغەمبەرانە ئەگەر لە یەکدیش جیاواز بن و پێنج لەو پێغەمبەرانە بە اولوا العزم ناسراون، کە نووح و ابراهیم و موسا و عیسا و محەمەد پێغەمبەرن، کەواتە لەوانی تر چاکەیان زۆرترە و پلە و پایەیان لای خودا مەزن ترە هەروەها ئەگەر شەریعەتیشیان لە نێوان خۆ و ئەوانی تر جیاواز بێ، بەلام لە ڕووی باوەڕەوە یەکن و یەك خودایان پەرستووە. لەو پێودانگەوە کە هەندێ پێغەمبەری بە سەر هی دی تەفزیل کردبێ وەك لە سورەتی بقرە دەفەموێ " تلك الرسل فضلت بعضهم علی بعض " ئایینیان لە ڕووی شەریعەتەوە جیاواز بێ و زمان و نەتەوەی پێغەمبەرەکان لێك جیاواز بێ، نابێ خوایان لە یەك جیاواز بێ. زاتی خودا بۆ هەموو پێغەمبەرە لە یەکجیوازەکان یەکخوایە. هەرچەندە پێغەمبەری شار و گوند بە گوێرەی جیاوازی کۆمەلگاوە لە یەك جیاواز بوونە، بەلام ئەو جیاوازی کۆمەلگایە دەرهاویشتەی واقیعە، بۆیە لە پەرستنی یەکخودا یەك بوونە. بە پێی واقیعەکە کاریان کردووە وەك دەلێن مرۆڤ کوڕی واقیعی خۆیەتی واتە دەبێ ئەو شتەنانە بلێ کە خەلکەکانیان تێبگەن. پێغەمبەری گوند لە ئاستی ڕۆشنبیری خەلکی گوند قسان دەکات بۆ ئەوەی کەنالی لە یەکگەیشتن لە نێوان پێغەمبەرەکە و خەلکی گوندەکە فەراهەم بێ، بەلام

پێغەمبەری شار بەو جۆرە بیر دەکاتەوە و قسان دەکات، کە خەڵکی شار قسان دەکەن، بۆیە ئەو ڕەنگاڵیەی پێغەمبەران ڕاڤەی ئایەتەکە دەکەن.

زۆر جێگە ی کتێبەکە پێویستی بە لە سەر ڕاوەستان هەیە، بەڵام ئێمە لە سەر ئەو شتانە قسە دەکەیین، کە زۆر زەقە و قسەی زۆر هەڵدەگری لە لاپەڕە ٥٤ ئەم کتێبەی، کتێبی "پلورالیزمی ئایینی " دەنووسێت: "زمانحاڵی هەموو دینداران (بەلکو تەواوی خەڵکی جیهان) ئەمەیە، کە " انا وجدنا ابا ْنا علی امة و انا علی اثارهم مقتدون–زخرف ٢٢ " نەوەك خەڵکی ئاسایی، بەلکو تەواوی پێشەوایانی ئایینیش هەر وانە " پێشەکی من نامەوێ بەرگری لە پێشەوایانی ئایینی بکەم، چونکە ئەوان لە شوێنێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی ئەوهان دەتوانن هەر لە من توندتر بەرگری لە خۆیان بکەن! ! جارێ ئەم ئایەتە و ئایەتی هاوشێوەی ئەو لە دەقی قورئان دووبارە بۆتەوە مەبەستی خودا لەو نەریتکەرانەی کۆمەلگا کەسانی توندڕەوی بێباوەڕن، بە هیچ جۆرێك کەسانی باوەڕدار نیینە. هەمیشە پیاوانی دەسەڵاتی مەنزومەی دەستەی کۆن، یان ئەوانەی بۆ نموونە لە دەسەڵاتی سیاسی نزیك بوونە بەو ئاخاوتنە، وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەرانیان داوەتەوە بەوەی وەکو نەریتێك

ئه‌وان له سه‌ر په‌رستنی ئه‌و بته که‌ڕ و لالانه به‌رده‌وامن، چونکه بینیویانه یان گوێ یان لێ بووه " که باوك و باپیرانیان له سه‌ر په‌رستنی ئه‌و بتانه بوونه " جا ئه‌و بتانه ده‌سه‌ڵاتی سوود و زه‌ره‌رپێگه‌یاندیان به به‌رانبه‌ر نه‌بێ، ئه‌وان هه‌ر به‌رگریان لێده‌که‌ن‌و نایه‌نه سه‌ر ئایینی پێغه‌مبه‌رێك که وه‌ك ئه‌وان بخوا و بخواته‌وه !ئه‌مه وه‌ڵامی نه‌ریتپه‌رسته‌کانه، به‌ڵام پێم سه‌یره د.سروش پێی وابێ پێشه‌وایانی ئایینیش به تایبه‌تی ئیسلامی ئه‌وها له ئایین بگه‌ن ! ئه‌م جۆره‌ی ڕاڤه‌یه‌ی د.سروش ته‌نیا له ئه‌قڵی سروش دایه نه‌وه‌ك ئه‌وان دیدێکی ئه‌وهایان هه‌بێت بۆ ئایین.له‌وانه‌یه وه‌ك دکتۆرێکی مه‌لا له خوتبه‌یکدا گوتی: مرۆڤ هه‌بێ له نوێژی خوتبه ئاماده بێ، به‌ڵام سه‌رکێشانه سوو بخوات و هێنده گوێ به سووخواردنه‌که نه‌دات!" ئه‌مه بۆ خه‌ڵکی عه‌وام ڕاستیه‌کی ڕێژه‌یی تێدایه، به‌ڵام ئه‌و که‌سه‌ی به ڕاستی پێشه‌وایه له‌و جۆره ڕاڤه‌یه دووره!

# کتێبی دووەمی سروش

# الصراطات المستقیمة

ئەم کتێبەی سروش بۆ یەکەمجار وەرگێرانە عەرەبییەکەی ساڵی ٢٠٠٩ بڵاوکرایەوە.ئەم کتێبە لە ٣٢٧ لاپەڕە دایە و ئەحمەدی قەبانچی لە فارسیەوە کردۆتیە عەرەبی، ئەم کتێبە خۆی لە چەند وتارێك پێکهاتووە کە گومان دەبردرێ لە وەختی جیاواز نووسرا بن.

لەم نووسینەدا هەوڵدەدەین شرۆڤەی ڕای سروش بکەین و وا بە چاك دەزانین لە ناونیشانی کتێبەکە دەست پێبکەین و هەوڵ و پێکۆڵ دەکەین چەند برگەیەك لە وتەکانی سروش شیبکەینەوە بۆ ئەوەی بگەینە ئەو ڕایەی کە دەکرێ " بیرمەند " لە بیرمەندەکانی تر جیاواز بێت! جیاوازی کەسێك لە کەسێك زیاتر لەو مەسەلەیە، کە ناسراون بە موتەغیرات، نەك جیاوازبوون لە ثوابتەکان! لە پاشان دەبینن، ڕایەکانی سروش لە ئەرکۆن و ئەبو زێد و عەلی حەرب....توندترە دەربارەی قورئان هەروەها جیاوازی ئەو لە هی تر لە سەر مەسەلە نەگۆڕەکانە!

ئه‌م کتێبه وه‌ك له ناونیشانه‌كه‌ی دیاره: ده‌بینین به پێچه‌وانه‌ی کتێبی پێشوو، سروش له نێو مه‌سه‌له‌کاندا بوونێکی فیزیکی هه‌یه. ڕای نووسه‌ر ئه‌وهایه له سه‌ر هه‌بوونی چه‌ند ڕێگایه‌کی ڕاست، نه‌ك ته‌نیا یه‌ك ڕێگای ڕاست له هه‌ناوی ئیسلامدا به تایبه‌تی قورئاندا. ئه‌و کتێبه‌ی پێشتر باسمان لێوه کرد، تێگه‌یشتنی خه‌ڵکه تا ڕاده‌یه‌ك به نووسه‌ر لێوه‌ی دووره، ئه‌وه ئایینه ناونیشانه‌كه‌ی دروست کردووه، نه‌وه‌ك ته‌نیا خودی نووسه‌ر. ئه‌م جۆره ڕاڤه‌یه کۆنه هه‌تا که‌سێکی وه‌ك " مه‌وله‌وی " ده‌وترێ ڕایه‌کی له سه‌ر زاتی خودا، بونه‌وه‌ر....هه‌بووه که دژ بووه له گه‌ڵ بیروڕای خه‌ڵکی ساده له قورئان! جیاوازی بیروڕای خه‌ڵك مه‌زهه‌به‌كانی دروست کردووه، خۆ له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ر هیچ جۆره مه‌زهه‌بێك نه‌بووه! سوونه وشیعه، شافیعی، حه‌نبه‌لی.....هه‌موو له دوایی وه‌فاتی پێغه‌مبه‌ر دروست بوون !ئێستا مه‌زهه‌به‌كان له وڵاته موسلمان نشینه‌كان هه‌ن هه‌موو لێكدانه‌وه‌ی قورئانن، به‌ڵام وه‌ك قورئان نین: مه‌رج نییه سه‌د له سه‌د قورئان ڕای ئه‌وها بێ، له‌وانه‌یه ڕای قورئان ئه‌وها نه‌بێ. ڕاستی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ی هه‌ڵگرت بێ بۆ سه‌رده‌مێکی تر، له سه‌رده‌مێکی تر ئه‌قڵی مرۆڤ شتێك داده‌هێنێت، ده‌بێ هه‌ڵبژارده‌ی دیندار وه‌ڵامی بۆ ئه‌و مه‌سه‌له نوێ یه پێبێت،

بۆ ئەوەی بسەلمێنێ قورئان وەلامی خۆی پێیە لە هەموو زەمان و شوێنێکدا.

دەتوانین کریمانی ئەوە بکەین، کە ئەم ناونیشانە ڕاڤەی خۆیەتی، نە وەك خەڵك. ئەو لە زۆر ڕاڤەکردنندا بە تایبەتی لە دیدارێکدا سەری لێشێواوە بەوەی دەڵێت: " قورئان داهێنراوی عەقڵی پێغەمبەرە " وە نەبێت ئەو باوەڕی بە بوونی خودا نە بێت، بەلکو باوەڕی وەك ڕۆژهەلاتناسەکان بەوەیە کە وەحی–سروش–ی قورئانی، دەروونیە، نە وەك وشەییە ! ئەم جۆرە دیتنە، سروش لە بازنەی ئیسلامەتی دەردێخێت ! ئەگەر وەحی پێغەمبەری ئیسلام تەنیا لە خودی پێغەمبەری ئیسلام تێپەڕنەکات، ڕۆڵی زاتی خودا ئەوەندە گرنگ نابێت ! ئەوەش هەڵوەشاندنەوەی گوتاری ئیسلام دەگەیەنێت.ئەم جۆرە دیتنەش زۆر دوورە لە ڕاستیەوە. لە ئیسلامدا زاتی خودا ئەوەندە گرنگە بە وشە تەعبیری لێناکرێت. کەواتە ئەو وەحییەی لە تەرەف زاتی خوداوە بۆ پێغەمبەرەوە هاتووە: کەلامی ئیلاهی بووە، نەوەك قسەی موحەمەد، یان ئیلهامی خودی موحەمەد .

نوختەیەکی دی دەربارەی ناونیشانی کتێبەکە ئەوەیە سروش دەیەوێ بلێ زیاتر لە ڕاستە ڕێیەك هەیە، کە ئەوەش دووبارە دژی گوتاری قورئانە، کە هەردەم جەخت لە سەر یەك ڕاستە ڕێ

دەکات. سروش تەواو لە گرامەری ڕستەکان نەگەیشتووە، ئەگەرنا هەبوونی " ال..." نەبوونی لە هەندێ دەقی دی نە دەکردە بەڵگە! بۆ نموونە ئێمەی موسلمان لە ڕۆژێکدا زیاتر لە ١٧ جار لە نوێژەکاندا دەڵێین: "اهدنا الصراط المستقيم-خودایە بەرەو ڕێگای ڕاست ئاراستەمان کە" ئەوە وشەی "الصراط " و "المستقيم " ال...هەیە گریمانەکەی سروش ڕەتدەکاتەوە.

هەروەها لە سەر بەرگ نووسراوە " خوێندنوەیەکی نوێ بۆ تیۆری پلورالیزمی ئاینی " وا دیارە ئەم کتێبە بەشێکی هەر کتێبی " پلورالیزمی ئاینی "-ە. لێرەدا هەروەك وتمان سروش لە بەشەکانی تر هەلوێستی خۆی دەربارەی پلورالیزمی ئاینی دەخاتە ڕوو.ئەگەر تێڕوانینی مەعریفی پانتایەکی فراوانیی پێبدرێ و بە هێزی هەبوونی بەڵگە گەنگەشە لە سەر ڕای کۆن بکرێ هەروەك شافیعی لە میسر لە سەر ڕای کۆنی خۆی کردی هەروەها مەسەلەی هزری پیرۆز نییە و دەکرێ قسەی لە سەر بکرێ، چونکە مەسەلەیەکی ئیلاهی نییە بەلکو مرۆڤکردەیە. مەسەلەی پلورالیزمی ئاینی مەسەلەیەکی نوێ نییە، بەلکو زۆر کۆنە. لەمەش زیاتر، لە سەر بونیاتی مەعریفی دروست نەبووە، بەلکو لە سەر شتی تر وەك ئاین، مەزهەب، عەلمانی، زەن....سازانی لایەنەکان دروست بووە!!

## هه‌ندێ نموونه له کتێبه‌که‌ی سروشه‌وه

له ده‌سپێکدا چه‌نده‌ها ئایه‌ت له سوره‌تی جیاواز ده‌هێنێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌وه بسلمێنێت که بوون و نه بوونی ئه‌لیف و لام، به تایبه‌تی نه بوونی ئه‌لیف ولام له هه‌ندێ ده‌قکدا به‌ڵگه‌ن له سه‌ر هه‌بوونی پلورالیزمی له هه‌ناوی قورئاندا؟! چونکه له زه‌نی سروشدا هه‌ر که ئه‌لیف و لام نه‌بوو به واتای پلورالیزم حزوری له ده‌قه‌که‌دا هه‌یه، ئه‌مه‌ش هه‌ڵه‌یه‌کی باوه که سروش خۆشی ده‌رك به‌وه ناکات که تێیکه‌وتووه .

سروش له‌م خوێندنه‌وه‌یدا ته‌واو سه‌رچیخ چووه، چونکه بۆچوونه‌که یاخود خوێندنه‌وه‌که ته‌واو دژ به گوتاری قورئانه، که جه‌خت له ڕۆڵی تاکخودایی و تاك ڕێگه‌یی ده‌کات، وه‌ك وتمان له‌وانه‌یه سروش بیه‌وێ خوێنه‌وه‌راکانی گومرا بکات، بۆچوونه زمانه‌وانییه‌کانی ده‌قه‌کان به هه‌ند هه‌ڵنه‌گرێت. هه‌ر له پێودانگه‌وه ده‌بینین که‌سانی سیکوله‌ر و هه‌ندێ ڕۆناکبیری ئیسلامی کوردی قسه و بۆچوونه‌کانی سروش به نه‌زه‌ر ئیعتیبار وه‌رده‌گرن. ئه‌مه مه‌سه‌له‌یه‌کی هزری نییه تاکو گه‌نگه‌شه و دایه‌لۆکی له سه‌ر بکرێ، ئه‌م مه‌سه‌له‌یه په‌یوه‌ندی به باوه‌ڕی مرۆڤه‌وه هه‌یه! ئه‌و قسه له

قورئان، كه‌واته وه‌ك خۆی بانگه‌شه ده‌كات قورئان داهێنانی هزری پێغه‌مبه‌ره !! به وه‌ڵامێكی ساده، كه پێشتر وه‌ڵامی وه‌حی بۆ پێغه‌مبه‌ر هاتوو–كه وه‌حی ه‌كی وشه‌ییه له نێوان خودا و پێغه‌مبه‌ر– له گه‌ڵ ئیلهامی شاعیران–كه حاڵه‌تێكی ده‌روونیه ته‌نها له زاتی شاعیر –ده‌ڵێین كه وه‌حی هاتوو بۆ پێغه‌مبه‌ر وه‌حی كه‌لامییه ، زاتی خوداش له قورئان ده‌فه‌رموێ: "هیچ پێغه‌مبه‌رێك ناتوانێ له خۆیه‌وه وشه‌یه‌ك له وه‌حیه‌كه بگۆرێ " لێره‌دا ده‌پرسین، كه پێغه‌مبه‌ر كه‌لامی قورئانی له خوا بیستبێت و دووباره به شێوه‌ی خۆی به ئێمه‌ی گه‌یاند بێ، پێغه‌مبه‌رایه‌تی چۆن دروست ده‌بێ ؟؟ چۆن هه‌ر كه‌سێك له كۆمه‌ڵگا به بێ هه‌بوونی به‌ڵگه ده‌توانێ بڵێ من پێغه‌مبه‌رم ؟! ئه‌و كه‌سانه‌ی وه‌حی خودایی ره‌تده‌كه‌نه‌وه خۆی له خۆیدا له بنه‌ره‌ته‌وه خۆی ئایینه‌كه ره‌تده‌كه‌نه‌وه. سه‌یدی قوتبی ره‌حمه‌تی ده‌یگوت " یان ده‌بێ ئه‌وه‌ی له ئیسلام هاتووه به گچكه و دروشتی وه‌ریگری یان واز له گچكه و دریشتی بێنی " ئه‌وانه وه‌ك قورئان ده‌فه‌رموێ باوه‌ڕ به هه‌ندێكی قورئان ده‌كه‌ن و باوه‌ڕ به هه‌ندێكی تر ناكه‌ن.

سروش و وه‌رگێره‌كه‌ی به‌و بۆچوونانه خۆیان ده‌خه‌نه ئه‌و قالبه‌وه.

لەو چەند ئایەتەی سروش بە نموونە هێناویەتیەوە، دەوێری بڵێ لە جیاتی یەك ڕێگای ڕاست ، چەند ڕێگایەکی ڕاست هەیە هەروەك ناونیشان و ناوەڕۆکی کتێبەکەی پێشبینی دەکەن، چونکە هەر خودی ناونیشانی کتێبەکە بە کۆ هاتووە: " الصراطاط المستقیمة —ڕێگە ڕاستەکان "ئەو ڕێگای ڕاستی نێو قورئان و تەوراتی جولەکەو ئینجیلی فەلەکان و ڕێگا ئادەمیەکان هەمووی بە ڕێگای ڕاست دادەنێت! لەو قسانە دەردەکەوێت، کە ئەو ڕێگا ڕاستەی قورئان پێشکەشی دەکات کە تاکە ڕێگا ڕاستی خودایە، ژمارەیەکە لە ژمارەکان!

لە زۆر جێگەدا باسی مەولانا مەولەوی دەکات کە لە لای کوردانی باشوور بە مەولانا ڕۆمی یان جەلالەدینی ڕۆمی ناسراوە، نە وەك مەولەوی شاعیری کورد بێت. ئەو وەسفانەی ئەو کردوویەتی بە تایبەتی ئەوەی لە وەرگێرانە عەرەبیەکەی هاتووە لایەق نیین، ئەوەتە لە لاپەرەی ٢٣ی الصراطاط المستقیمة وەرگێرانەی عەرەبیەکەی هاتووە: " اولا اری انه خاتم العرفا و ثانیا: ان بیانه یمثل احلی و اجمل بیان." من نکوولی لەوە ناکەم کە مەولانا ڕۆمی چەندە ئیمانی لە من بەرزترە، بەڵام نکوولیش لەوە ناکەم ئەو مرۆڤە هەڵە و ڕاست دەکات وەك هەموو مرۆڤەکان. ئەگەر سروش

پشت ئه‌ستور بێ به‌ قسه‌کانی مه‌ولانا ڕۆمی، ئه‌وا ئه‌و به‌و وه‌سفه ڕازی نییه باوه‌ڕی به‌وه‌ نییه، که‌ جگه له‌ ڕاستی له‌ قورئان هاتووه له‌ ته‌وراتی جوله‌که‌ و ئینجیلی فه‌له‌ هه‌بێ!

جا پێویست ناکات دڵی خۆی به‌ قسه‌ فه‌لسه‌فیه‌کانی مه‌ولانا ڕۆمی خۆش بکات له‌ مه‌ڕ تیۆری پلورالیزمی ئاینی ! ئه‌و جۆره قسانه له‌ باره‌ی مه‌ولانا زۆر نزیك و تایبه‌تن به‌ خودا و پێغه‌مبه‌ر. خاته‌می عاریف نزیکه‌ له‌ خاته‌می پێغه‌مبه‌ران، قسه‌ جوان و شیرینه‌کانی ڕۆمی نزیکه‌ له‌ قسه‌ جوان و شیرینه‌کانی خودا له‌ قورئان ! ئه‌و به‌راوردکردنه له‌ خۆڕا نییه ئه‌وه‌ته وه‌رگێڕی کتێبه‌که‌ی سروش له‌ کۆڕێکدا به‌ ئاشکرا ده‌ڵێت قسه‌ی ئیمامی عه‌لی له‌ قسه‌ی خودا به‌ موعجیزه‌ و به‌ ڕه‌وانبێژی تره‌ ! ئایا هه‌رگیز ئیمامی عه‌لی به‌و به‌راوردکردنه ڕازیه‌؟!

ئه‌وه‌ی له‌ لاپه‌ره‌ ٢٣ و ٢٤ به‌ ناوی جه‌لاله‌دینی ڕۆمی ده‌یلێت: " ئه‌ی عه‌قڵی ئاماده‌: له‌ ڕێگای ڕوانینه‌وه‌ باوه‌ڕدارێك و ئاگرپه‌رستێك‌و جوله‌که‌یه‌ك جودان! هه‌روه‌ها ده‌ڵێت ئیسلام و ئاگرپه‌رستی و جوله‌که‌یی سێ ئایینی جیهانین له‌ خالّی هه‌ق و باتیل جیاواز نین، به‌لکو ته‌نیا له‌ ڕواڵه‌ت و بینینا-ڕوانگه‌یا-له‌ یه‌ك جیاوازن" ....

من جەلالەدینی ڕۆمی هێندە ناناسم ئەو هەبێ یان نەبێ هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. وەکو جارێک لە پۆلدا وتم کەسێکی وەك بەختیار عەلی هەبێ یان نە بێ هیچ لە مێژووی ئەم نەتەوەیە و کۆمەڵگایە ناگۆڕێت، چونکە زەمەنی ئەوە بە سەرچوو ڕۆمان یان دیوانە شیعرێك میللەت و کۆمەڵگایەك بگۆڕێ. قوتابیەك دیار بوو زۆر بەو قسانە تێکچوو وتی نەخێر ئەگەر بەختیار نەبێ.......بە ڕیفراندۆمێك لە ناو قوتابیانی قۆناغی چواری کۆلیج تەنیا سێ قوتابی ناوی بەختیاریان بیستوو بوو ! بە قوتابیەکەم گوت بەو ڕێژەیە کەمە بە ناسینی ئەو، میللەتی کورد لە ناونەچووە وەك تۆ بانگەشە دەکەی !! با گریمان بکەین قسەکانی ڕۆمی گەر ڕاست بن وای گوت بێ، ئەوا قسەکانی سروش زۆر کۆنن و ئەو مەسەلەی ئەو خۆی پێ سەرقاڵ کردووە ئەوا زۆر پێش ئەو ڕۆمی گوتویەتی! لە بنەڕەتدا هەرسێ ئایین لە یەك ژێدەر هاتوون، بەڵام گۆڕینی تەورات و ئینجیل لە دەسەڵاتی جولەکە و مەسیحیەوە وایکردوو ڕۆڵی خودا لە مەسەلەکان بزر بکرێ یان وا پیشانبدرێ پاکی بۆ خودا، خودا هەر خودای جولەکە و فەلە و گاور بێت کە ئەمەش بە هیچ جۆرێ لە گەڵ دەسەڵاتی ڕەهای زاتی خودا

یەکناگرێتـەوە. لـەو ڕوانگـەوە قورئـان لـە گـەڵ ڕوانـینی تـەوراتی جولەکە و ئینجیلی فەلەکان جودایە.

زاتـی خـودا لـە قورئانـدا بـوونێکی موتڵـەقی هەیـە و بـەڵام لـە دووەکـەی تـر کـە لـە لایـەن مرۆڤـەوە نووسـراون، ئـەو دەسـەڵاتە ڕەهاییەی لـێ سـەندراوەتەوە.ئەحمـەد هیدایـەت بـە ڕەحمـەت بـێ چەندەها هەڵەی لە چاپە جیاوازەکانی ئینجیلی فەلەکان دۆزیتەوە، پاکی بۆ زاتی خودا، چۆن دەبێ خـودا هەڵـە بکـات ؟؟!!!سـروش تەواو لە زات و زانـینی خـودا نەگەیشتووە، ئەگـەرنا وەك قەبانـچی ئەوها لە خودا نە دەدوا!!

لـــە ڕووی زانیارییـــەوە لـــە ڕۆژی ئـــەمڕۆدا ئاگرپـەرســـتی و جولەکایەتی جیهانی نین. ئاگرپـەرستی ئاماژەیە بۆ زەردەشتیەت، چۆن زۆربەی مەسیحیەکانی ئەمڕۆ لە دەرەوەی بـاوەڕی مەسـیحن، بە هەمان شێوە ئاگرپەرستەکان لە دەرەوەی باوەڕی زەردەشتن ! چـۆن جولەکـەکان هەوڵیانـدا مەسـیح بکـوژن، کوردەکـەکان لـە کوشتنی زەردەشت سەرکەتوو بوون!! ئایینەکان بێجگە لە ئیسلام بۆ هەموو جیهان نەبوونـە تـەنیا بـۆ نەتـەوەی جیـاواز بوونـە، بۆیـە جگە لە ئیسلام هیچ ئایینێك جیهانی نییە!

کە دەوترێ هەرسێ ئایینەکە بەو شێوەیە لە جیاکردنەوەی هەق و باتیڵ جیاواز نیین تەنها لە ڕواڵەت و ڕوانین بۆ زاتی خودا جیاوازن، بە واتای سروشەوە هەر یەکەی بە جۆرێك تەماشای زاتی خودا دەکەن بەمەش سەلامەتی تیۆری پلورالیزمی ئایینی لە قورئان بسەلمێنێت !! ئەو دیتنەی سروش زۆر دوورە لە ڕاستیەوە، چونکە هەر قورئان وەك دەقێکی ئاسمانی ماوە هەرچی تەورات و ئینجیلە ئەوە بوونەتە دەقی مرۆڤکردە، نەوەك ئاسمانی بە جۆرێك هەر پسپۆر و زانایانی مەسیحی بە لێکۆڵینەوە گەیشتوونە ئەوەی، کە کتێبی " کتێبی پیرۆز " لە سەدا شازدەی کەلامی خودایە، ئەویتر هەمووی کەلامی مرۆڤە، کەواتە چۆن دەتوانین بوونی خودا بە دروستی لە تەوراتی جولەکە و ئاڤێستای ئاگرپەرستی یان زەردەشتی و ئینجیلی فەلە بدۆزینەوە! بۆیە ئەمە دوور لە پایەی ئەکادیمیەتە، ئەوانە بە شێوەیەی هەن لە گەڵ قورئان بەراورد بکرێن؟!! ئەوانە هەموو مۆرکی ئاسمانییان لێ سەندراوەتەوە هەرچی قورئانە خودا خۆی بەڵێنی داوە، کە بیپارێزێ لە دەستی مرۆڤ. وەك لە شوێنێك گوتمانە ئەوانە ئایینی نەتەوەیین لە ڕووی زمان و ناوەڕۆکەوە کەچی قورئان بۆ هەموو میللەتانی سەر زەوی ڕەحمەتە: ئەوانەی چوونەتە حەج چاکتر

ده‌زانن خودای ناو قورئان خودای هه‌موو میلله‌تانه، چونکه له‌وێ عه‌ره‌ب له چاو میلله‌تانی دی ڕێژه‌یه‌کی زۆر که‌م له ڕووی ژماره‌وه پێکده‌هێنێت!

کتێبه‌که‌ی سروش قسه‌ی وای تێدایه که له گه‌ڵ باوه‌ڕ و تێگه‌یشتن و میزاژی خه‌ڵکی عه‌وام ناگونجێت. من چی تر ناتوانم قسه نا لۆژیکه‌کانی سروش بگوازمه‌وه. ئه‌وه قسه‌کانی سروش قسه‌کانی سه‌لمان روشدیم له ئایه‌تی شه‌یتانی ده‌هێنێته‌وه یاد که لاپه‌ڕه‌یه‌ك نییه به ڕوونی وه‌ڵامی بده‌ینه‌وه....هه‌ر له‌و ڕوانگه‌وه هه‌ندێکی تر له قسه‌کانی سروش ده‌هێنینه‌وه که چۆن قسه‌ی وا ده‌کات ته‌واوی باوه‌ڕی مرۆڤی ساده به‌ره‌و هه‌ڵوه‌شانه‌وه یان هه‌ڵدێر به‌رێت! ئه‌وه نییه به ناوی بیرمه‌ندیه‌وه هێنده ئازادی بێ قه‌ید و شه‌رت بدرێته بیرمه‌ندێك که قسه له سه‌ر باوه‌ڕی خه‌ڵك بکات، ئه‌و به خۆی بۆ خۆی ئازاده له لایه‌ن خوداوه که کافر بێت به‌وه‌ی له قورئان هاتووه، به‌ڵام قسه‌کردن له سه‌ر باوه‌ڕی خه‌ڵك به‌زاندنی ئازادی خه‌ڵکانه و له گه‌ڵ چه‌مکی ئازادی ناسازێت! له لای ئێمه‌ش ڕۆژنامه‌نووسی ئازاد هێنده ئازاد کراوه که سنووری ئازادی خه‌ڵك ببه‌زێنێت. هه‌روه‌ها جۆره مه‌عصومیه‌ك دراوه‌ته ڕۆژنامه‌نووسه‌که به‌وه‌ی نابێت بگیرێت. ئه‌و جۆره مه‌عصومیه به

قول بعض هؤلاء المغرضين....بأني أقول بتحريف القرأن! ! و على فرض صحة ذلك فأن بعض علماء الشيعة الكبار ذهب الى هذا رأي....."ط. ڕێگای هزر ژماره ٦ لا.٦٨. ده‌ڵێت گه‌وره زانایانی شیعه پێش من ڕایان وا بووه كه قورئان ده‌سكاری كراوه ! وه‌ك وتمان ده‌زگای ئایینی شیعه و كه‌نیسه‌ی ڕۆژئاوا ئه‌و ڕایه‌یان ده‌رباره‌ی قورئان هه‌یه، خاڵی دووه‌م له‌ ڕووی ئه‌كادیمیه‌وه سروش چی زیاتری له‌ هه‌ندێ ئاخونده‌ی شیعه و كه‌نیسه‌ی ڕۆژئاواوه زیاتر له‌ باره‌ی قورئان گوتووه !!

ئه‌وا گریمان ڕۆمی پێش (سروش) باسی له‌ پلوراليزمی ئایینی كرد بێت و هه‌ندێ ئاخونده‌ی شیعه گوتبیان قورئان ده‌سكاری كراوه: ئه‌دی سروش چی نوێ ی هێناوه؟؟! !ئه‌ویش هه‌ر ئه‌و قسه هه‌له‌ق و به‌له‌قانه دووباره ناكاته‌وه ؟!

له‌ ڕوانگه‌ی نووسینی ئه‌كادیمیه‌وه ده‌كرێ ئه‌و گریمانه‌ی له‌ پێشه‌وه پێشكه‌شكراون له‌ نووسینه‌كه بێنێته‌دی یان ڕه‌فز بكرێنه‌وه ؟ ئێمه له‌ ته‌واوی نووسینه‌كه چه‌ندمان پێكرا بێ، وه‌ڵامی سروشمان داوه‌ته‌وه، كه قورئان به‌رییه له‌و زه‌ن و گریمانه‌ی به ده‌روونی نه ساغی (د.سروش)دادێن: له‌ دیدی ئه‌و قسه‌یه‌ی شافیعی، كه ڕاڤه و ته‌ئویلی ناشیاو و نادروستی بۆ ده‌كرێ.

(د.سروش) هه‌وڵ ده‌دات له‌ ژێده‌ری تره‌وه‌، نا ئیسلامی، قورئان به‌ خوێنه‌رانی بناسێنێت. که‌سێکی وه‌ك (هیك)، ئه‌و باوه‌ڕی به‌ هه‌بوونی سێینه‌ هه‌یه‌، که‌چی (د.سروش) به‌ که‌سێك که‌ به‌ باوه‌ڕی به‌ خودای تاقانه‌ هه‌یه‌، به‌ خوێنه‌رانی ده‌ناسێنێت!

وته‌که‌ی شافیعی، که‌ له‌ سه‌ر بونیاتی باوه‌ڕبوون به‌ ژێده‌ره‌کانی ئیسلامه‌وه‌ دامه‌زراوه‌: " ڕای من ڕاسته‌، به‌ڵام هه‌ڵه‌بوون هه‌ڵده‌گرێ، ڕای به‌رامبه‌ره‌که‌م غه‌ڵه‌ته‌، به‌ڵام ڕاستبوون هه‌ڵده‌گرێ." بوونی ئه‌و هه‌موو مه‌زهه‌به‌ له‌ سه‌ر ڕای خوێندنه‌وه‌ و ڕاڤه‌ی جیاواز بۆ قورئان و فه‌رمووده‌ دروست بوونه‌، نه‌ك له‌ سه‌ر ڕای ته‌وراتی جوله‌که‌ و ئینجیلی مه‌سیحی و هتد ! قسه‌کردن له‌ سه‌ر هه‌بوونی باخێك له‌ باخه‌کانی زه‌وی، که‌ ئاده‌م و حه‌وای لێنیشته‌جێ بووه‌ ڕایه‌که‌ ده‌چێته‌ خانه‌ی هزری ئیسلامی، نه‌ك باوه‌ڕی ئیسلامی، ده‌کرێ قه‌بوڵ بکرێ یان ڕه‌فزیکرێ ! ئه‌و ڕایه‌مان هه‌ر له‌ ژێده‌ری ئیسلامی وه‌رگرتووه‌، نه‌ك نا ئیسلامی. هه‌ر بۆ نموونه‌ قورئان له‌ چه‌ند جێیه‌ك دووباره‌ی ده‌کاته‌وه‌، که‌ ئاده‌م و حه‌وا به‌ره‌و داره‌ قه‌ده‌غه‌کراوه‌که‌ چوونه‌، هه‌ردووك به‌ری داره‌که‌یان خواردووه‌، هه‌ردووك له‌ ئه‌نجامدا به‌رگیان له‌ به‌ر بۆته‌وه‌، به‌ڵام ئینجیلی مه‌سیحی مرۆڤکرده‌ نه‌ك خواکرده‌، ده‌ڵێ

حه‌وا به‌ره‌و داره‌که چووه ئاده‌می هانداوه، که یه‌که‌م تاوان بکات و یه‌که‌م تاوان به ئاده‌م بکات ! من به هیچ جۆرێ قسه له سه‌ر دوو بابه‌تی جیاواز له دوو ژێده‌ری هه‌ڤدژی یه‌کتر ناکه‌م!!

ئه‌وه‌ی (سروش)کردوویه‌تی ته‌واو پێچه‌وانه‌ی کاری منه له‌و دوو ته‌وه‌ره‌دا، ئه‌و هاتووه له ژێده‌ری تره‌وه یان ته‌ئویل و ڕاڤه‌ی تره‌وه وه‌ك(ئه‌بو زێد) ته‌ئویل بۆ قورئان ده‌كات!

شافیعی له‌و وته‌یه ده‌یه‌وێ بڵێت ڕای ئه‌ویدی کاتێ ڕاستره له ڕای ئه‌و، ئه‌گه‌ر بێتوو له سه‌ر به‌ڵگه‌یه‌کی قورئانی یان فه‌رمووده دامه‌زرا بێت که ئه‌و ده‌ستی پێ ڕانه‌گه‌یشتبێ یان ده‌رکی پێ نه‌کرد بێ. هه‌مان شتیش ده‌رباره‌ی ته‌مه‌نی عائیشه دروسته، که‌سێ وه‌ك (مالکی کوڕی ئه‌نه‌س) باوه‌ڕی وابێ که له عێراق و له‌و ته‌مه‌نه گه‌وره‌یه‌ی (هیشامی کوری مه‌روه) که یاده‌وه‌ری خراپ کردووه، بۆیه فه‌رمووده‌ی لێوه‌رناگیرێ: ئه‌و ڕایه وه‌ك دیاره له سه‌ر ڕایه‌کی دی ئیسلامی دامه‌زراوه، جا له بنه‌ڕه‌ته‌وه کامه‌یان دروست بێ گرنگ نییه، چونکه ئامانج له په‌سندکردنیان یه‌کیان به سه‌ر هی تر خزمه‌تکردنه به ئیسلام، به‌ڵام ئه‌وه‌ی(د.سروش) ده‌یکات گومان دروستکردنه له هه‌ندێ ده‌قی قورئان به ده‌قی دی ده‌ره‌وه‌ی چوارچێوه‌ی قورئان !

دەبینن!!) دەژیان و ئیسلام غیابە لە دەسەڵات و ئیدار و حكومەت بە هیچ جۆرێ جورئەتی ئەوەیان نە بوو وەك د.سروش و وەرگێڕەكەی قسە لە دەقەكانی قورئان بكەن.

ئەو بیرۆكەكەی قسە لە سەر ئیسلامی تەقلیدی و لیبرالی دەكات: دەیانەوێ واپیشان بدەن كە ئیسلامی تەقلیدی كاتی بە سەر چووە و تاكەكان بەرەو توندڕەوی هاندەدات، هەرچی "ئیسلامی لیبرالیە " ئیسلامێكی كراوەیە و قەبولی هەر بیرۆكەیەك دەكات، یەكێ لەوانە كرانەوەی مانایە.....

ئەو جۆرە بیركردنەوەیە لە دەرەوەی جیهانبینی قورئانە، قورئان قەبوڵی هیچ بیرۆكەیەكی نامۆ و زۆڵ ناكات، قورئان ئەوە ١٤ سەدەیە وەك خۆی ماوە، چونكە خاوەن دیدگا و گوتاری خۆیەتی وەك ئینجیلی مەسیحی قەبوڵی ناكات ژمارەیەك بێت لە ژمارەكان، جا گرنگە هەر كەسە ناسنامەی خۆی هەبێت و بە ناسنامەی خۆی بەرگری لە هزری، باوەڕی، مەزهەبی خۆی بكات!

هەرئەوەش وای لەو ژمارەی ڕاڤەکاران کردووە، کە زۆر ئایەت تەفسیرێکی "پیاوی–نێری" بۆ بکەن، کەچی خودی قورئان دوورە لەو تێگەیشتنە.

لە سەرەتاوە وەکو گوتمان، ڕۆژهەڵاتناسەکان، سیکولەریستەکانی عەرەب و فارس و کورد هەموو لە سەر چەند خاڵێک کۆکن! کە هەموومانمان پێکەوە هێناوە یەکێك لە ئامانجەکانی ئەو گریمانانە دەپێکێن، کە لە دەسپێك باسمان کردووە. ئێمە باوەڕمان وایە، کە سەرچاوەی قسەکانی بەشێك لە سیکولەرە عەرەب و فارس و کوردەکان، تەنیا قسەکانی موبەشیرو مەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکانە، نەك زادەی عەقڵ و تێفکرینەکانی خۆیان بێت!! بەڵکو قسەکانی ئەوان دەجونەوە یان قسەکانیان لە سنووری ڕەخنەکانی قورەیشەکانی دەرەوەی بازنەی ئیسلامەتی تێپەڕ ناکات! قسەکان و ڕەخنەکانی ئەوان لە چەند خاڵێك کورت دەکەینەوە:

## یەکەم. وەحی نەبوونی دەقی قورئان

هیچ گومانی تێدا نییە، کە لە نەزەر ئێمەی موسلمانەوە قورئانی پیرۆز سروشێکە و لە تەرەف زاتی خوداوە بۆ پێغەمبەر دابەزیوە. بەیوەندی کەلامی ئاسمان و زەوی لە ئینجیلەوە کۆتایی پێ

نەهاتووە، بەلکو خودا لە ڕێگای ناردنی قورئانەوە کۆتایی بەو پەیوەندیە کەلامیە هێناوە ! بە واتای کۆتایی پێ هێنانەکە ئاسمانیە، نەك مرۆڤکردە، وەك پیاوانی کەنیسە بانگەشەی بۆ دەکەن!

لە کتێبی " ٢٣ ساڵ پێغەمبەرایەتی " و "قورئان مەعصوم نییە" و "ئیسلام لە محەممەدەوە تا بن لادن " ئەو سێ کتێبە ڕەخنەیە لە قورئانی پیرۆز بە چەند کتێبێکی ئیسلامی وەڵام دراونەتەوە و کاری ئێمەیان ئاسان کردووە! ئێمە وەك ئەوان بە لاپەڕە و پەڕەگراف وەڵامی ئەو کتێبانە نادەینەوە!! بە شێوەیەکی جیاواز قسە لە سەر قسەکانیان دەکەین، ئەمە مانای وا نییە کە ئەوەندە وەڵاممان پێ نییە بە بەڵگە وەڵامی قسەکانی ئەوان بدەینەوە!!

ئەو کتێبانە هەموو دەڵێی یەك کەس نووسیەتی، بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز ! لە ڕەخنە و قسەکانیان دەردەکەوێت، کە دەیانەوێ سیفەتی پێغەمبەری لە پێغەمبەری ئیسلام ڕادەماڵن و سیفەتی ڕیفۆرمخواز بە پێغەمبەری ئیسلام دەخشن! لە ڕاستیدا پێغەمبەری ئیسلام هەم دوا پێغەمبەر و هەم ڕیفۆرمخواز بووە.قورئانی پیرۆز وەڵامی قورەیشکانی کۆن و نوێ ئاوا لە چەند

ده‌قێکی قورئـان بـاس ده‌کـات: " خـۆی دایهێنـاوه...گـه‌لانی دی هاریکاریـان کـردووه! ئه‌فـسانه‌ی پێـشینه‌کانه....زمـانی مرۆڤـه و په‌یوه‌ندی بـه زمـانی خـوداوه نییـه..." هه‌نـدێ له‌وانـه قـسه‌ی وا ده‌که‌ن: خودا به‌و جۆره نییه که لـه قورئـان هـاتووه! هه‌نـدێکیتر، هـه‌ر وه‌حـی بـوونی قورئـان ڕه‌تده‌که‌نـه‌وه و ده‌ڵـێن به‌شـێکی لـه ته‌ورات و ئینجیل وه‌رگیراوه! قورئان له چه‌نده‌ها ده‌ق باسـی ئـه‌وه ده‌کات، " که له پێشتریش نوێژ و ڕۆژوومان به سه‌ر خه‌ڵکی به‌ر لـه ئێـوه سه‌پاندووه " ئه‌مـه‌ش لـه بنه‌ڕه‌تـدا، نـه‌ك ڕه‌خنـه نییـه لـه قورئان، به‌لکو بـه پێـچه‌وانه وه‌لامـه، چونکه خـه‌ڵکی دژه ئیـسلام نابێ ڕه‌خنه‌ی ئه‌وه له قورئان بگرن به‌وه‌ی له‌و سروته ئایینانـه لـه ئاڤێستا و ته‌ورات و ئینجیل وه‌رگیراوه، به‌لکو ده‌بێ له گه‌ڵ قورئان دابن، که ئه‌و کتێبانه و قورئان له یه‌ك سه‌رچاوه هـاتوون، ئـه‌ویش خودایه نه‌ك موحه‌ممه‌د!! کاتێ کـه پیـاوانی ده‌سـه‌ڵاتی ئه‌نزیمـه‌ی عـه‌ره‌ب لـه مه‌کـه، شـاندێکیان بـه سـه‌رۆکایه‌تی عـه‌مری عـاص و عبـداللای ئـه‌بی ڕه‌بیعـه–پـێش موسلمانبوونیان–بـۆ لای نه‌جاشـی پاشای حه‌به‌شه نارد، که ئه‌و موسلمانه‌ی هاتوونه ئێـره لـه ئـایینی باب و باپیرانمان لایانداوه و له سه‌ر ئایینی تۆ (مه‌سیحیه‌ت) نین و قسه‌ی ناشـرین بـه عیـسا و مریـه‌می دایکـی ده‌ڵـێن، پـاش ئـه‌وه‌ی

جه‌عفه‌ری کوڕی ئه‌بو تالیب هه‌ندێ له سوره‌تی مریه‌م بۆ نه‌جاشی له سه‌ده‌ی شه‌شه‌م ده‌خوێنێته‌وه، ئه‌ویش، که پاشای ولاته، ده‌ڵێت: ئه‌و وشانه و ئه‌وه‌ی له ئینجیل هاتووه له یه‌ك سه‌رچاوه هاتوون.هاوژێده‌ربوونی کتێبه ئاسمانییه‌کان له هه‌ندێ شت، وه‌ك هه‌بوونی نوێژ و ڕۆژوو..به قازانجی خودی قورئان ته‌واو ده‌بێ، که خاوه‌نه‌که‌ی زاتی خودایه.

نووسه‌رێکی سیکوله‌ری کورد ماوه‌یه‌ك له ڕۆژنامه‌یه‌کی کوردی چیرۆکه‌کانی ناو ته‌وراتی بلاوده‌کرده‌وه، ئێستا کردوویه‌تی به کتێب، مه‌به‌ستی بوو بڵێ ئه‌و چیرۆکانه‌ی له قورئان هاتوون له ته‌ورات وه‌رگیراون؟؟! !له ڕاستیدا نه ئه‌و چیرۆکانه‌ی له ته‌ورات هاتوون نه ئه‌وانه‌ی له یاساکانی حه‌مورابی و سۆمه‌ریه‌کان هاتوون له گه‌ڵ ئه‌وه‌ی له قورئان هاتوون له گێڕانه‌وه و تان و پۆ و به‌شێ له کاره‌کته‌ره‌کان و ڕووداوه‌کان، ئامانج لێیان ته‌واو جیاوازه هه‌روه‌ها ده‌رباره‌ی ئاینده‌ی هه‌ندێ له ڕووداوه‌کاندا هه‌ندێ قسه‌ی غه‌یب کراوه که یه‌که‌مجاره ده‌وترێ، که نه عه‌ره‌به قوره‌یشه‌کان نه جوولوکه و مه‌سیحیه‌کان له ته‌ورات و ئینجیله‌کانیان پێشبینیان نه‌کردبوو! !

وێرای ئه‌مه‌ش، جۆرج سیلی ڕۆژهه‌ڵاتنناس له‌ ساڵی ١٧٣٦ دا ده‌نووسێ: " ئه‌وه‌ی گومانی تێدا نییه‌، كه‌ موحه‌ممه‌د نووسه‌ری قورئان و خۆی دایهێناوه‌..........."له‌ لایه‌ك دووباره‌ سیكوله‌ری كورد ئه‌و مه‌سه‌له‌ كۆنه‌ دووباره‌ ده‌كه‌نه‌وه‌ كه‌ ته‌مه‌نی به‌ قه‌د دابه‌زینی قورئانه‌، له‌ لایه‌كی تر شاره‌زووری ڕه‌حمه‌تی ٣٠-٤٠ ساڵێك نامیلكه‌یه‌كی له‌ باره‌ی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ داناوه‌ و وه‌ڵامی ئه‌و كه‌سانه‌ ده‌داته‌وه‌ كه‌ ده‌ڵێن قورئان دانراوی موحه‌ممه‌ده‌ ! !

ئه‌و به‌ڵێن و ئاخاوتنانه‌ی له‌ قورئاندا هاتوون ئه‌وه‌ ده‌سه‌لمێنن، كه‌ هیچ زێده‌رێكی مرۆڤكرده‌ له‌ قورئاندا نییه‌ و قورئان كه‌لامی ئه‌به‌دی خودایه‌ په‌یوه‌سته‌ به‌ ده‌سه‌ڵاتی خوداوه‌.وه‌حیه‌كه‌ له‌ خوداوه‌ بۆ هه‌موو مرۆڤه‌وه‌ ! !

## دووه‌م: نائاماده‌گی وه‌حی یان كێشه‌ له‌ نێوان وه‌حی و ئیلهام

چۆن بزانین و دان به‌وه‌ بنێین ئه‌و سروشه‌ی بۆ پێغه‌مبه‌ر هاتووه‌ دروسته‌ و ده‌كرێ ژیانی ئێستا و ئاینده‌ی له‌سه‌ر بنیات بنێین ؟؟ یان ڕێكتر به‌ گوفتار و ڕه‌فتار له‌ سه‌ری بژین ؟؟ جه‌سته‌یی و غه‌یبی له‌ گه‌ڵ ئه‌و وه‌حیه‌ ئیلاهیه‌ بژین؟

ئه‌و سروشه‌ی بۆ پێغه‌مبه‌ر دابه‌زیوه‌ هه‌موو كاتێ له‌ سه‌ر بنه‌ما و شه‌نگستی ئیسلامی بۆ غه‌یره‌-ئیسلامی شرۆڤه‌ بكه‌ین ؟

هه‌روه‌ها ناشکرێ هه‌موو کاتێ سیکولاریزم بۆ بابایه‌کی ئیسلامی شیتاڵبکرێ، چونکه هه‌ردوو لا ناسنامه‌ی ئیسلامی و غه‌یره‌-ئیسلامیان وه‌رگرتووه، چونکه باوه‌ڕ و ئایدۆلۆژیایان جیاوازه له یه‌کتر!!

به حوکمی ئه‌وه‌ی "کتیبی پیرۆز"، که په‌یمانی کۆن -ته‌ورات‌و په‌یمانی نوێ -ئینجیله، نه‌ك ته‌نیا به قه‌وڵی قورئان به‌لکو به قه‌وڵی ٢٠٠ زانای مه‌سیحی ئینجیل ته‌نها له سه‌دا شانزه‌ی ئاسمانییه-قه‌وڵی خودایه، ئه‌ویدی هه‌مووی قه‌وڵی مرۆڤه!!!!له لایه‌کی دی، هه‌ر چوار ئینجیله‌که ناوی مرۆڤی له سه‌ره: ئینجیلی مه‌تی، ئینجیلی لۆقه.....!! ڕۆژهه‌ڵاتنناسه‌کان بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و ڕاستیه بپۆشن ئه‌وه‌یان بڵاوکرده‌وه، که ده‌بێ قورئان وه‌کو ئینجیل له ده‌ستی مرۆڤ به دوور نییه!! هه‌ر له‌و باره‌یه‌وه موبه‌شیره‌کان کتێبێکیان ده‌رکردووه به ناوی: ئایا قورئان مه‌عصومه؟؟ ئه‌و کتێبه به هه‌ندێ گۆڕانی که‌مه‌وه کراوه‌ته کوردی!!!! به هه‌ردوو لا تیۆرێکی نوێیان داهێنا به ناوی "خوێندنه‌وه به پیت" و "خوێندنه‌وه به مانا"، خه‌ته‌ری ئه‌و دووه‌ش ده‌رباره‌ی ده‌قێکی وه‌کو قورئانی پیرۆز هه‌ر یه‌که‌ی به ته‌نها بێ، ترسناکه، چونکه هه‌ردوو پێکه‌وه‌ن!! ناکرێ پیته‌کی

قورئان یان وشەیەکی بگۆردرێ بە پیتێکی تر یان وشەیەکی تر ؟؟ چونکە قورئان کەلامی خودایە و ئەویدی کەلامی مرۆڤە.زاتی خودا بەڵێنی داوە کە قورئان بپارێزێت، بۆیە هەر گۆڕانێك لە بنیاتی هەر وشەیەك لە قورئان دەردەکەوێت، بەڵام زاتی خودا بەڵێنی ئەوەی نە داوە کە ئینجیل دوا کتێبی ئاسمانیی بێ و پارێزراو بێ.

جا ئەوەی دەقی قورئان لە هەر دەقێکی جیا دەکاتەوە ئەوەیە کە وەحی قورئان بە لەفز و مانا بووە!! ئەوە وەك مەسەلەی بەرز بوونەوەی پێغەمبەر بووە بۆ ئاسمان !! قورەشیەکان و هەندێ سیکولەری عەرەب و کورد نکۆلی لە بەرزبوونەوەی جەستەیی پێغەمبەر دەکەن؟! هەر بۆ ئەوەی گومان لە یەقینی مرۆڤ بکەن، ئەوا دەڵێن زاتێکی وەکو "ئیبن مەسعود" باوەڕی ئەوها بووە، کە سوڕەتی "الفاتحه و المعودتین " لە قورئان نییە!!! ژمارەیەکی زۆر لە کۆن و نوێیەکان وەڵامی ڕەخنەگرانی ئەو قسەیان داوەتەوە بەوەی نە ئەو قسەی وای کردووە نە ئەو سێ سوڕەتەش بەشێك لە قورئانی پیرۆز پێکناهێنن.

کەسێکی وەك د.سروش باوەڕی وایە، لە پرۆسەی قورئان لە ئاسمانەوە (لە لوح محفوظ) بۆ زەوی، **پرۆسەیەکی ئیلهامی بووە**، بە واتای موحەمەد تەنها بە گیان نەك بە جەستە بەرزبۆتەوە بۆ

دیداری خودا. چۆن شاعیر ئەندێشە دەکا و لە خەیالی خۆی لە بونیادی خۆی دەرناچێت، خودا لەو پرۆسەیە دانییە. ئەوەی ڕاستی بێت خودا لەو هاوکێشەیە ئامادەگی هەیە و بەشێوەی وەحی قورئانی لە ڕێگای فریشتە جبرایل قورئانی گەیاندۆتە پێغەمبەرەوە. پێغەمبەر بە جەستە بەرزبۆتەوە هەتا تەحیاتی نێو نوێژ لەو دیدارە ڕەبانیە دروست بووە. کەواتە ئەوەی بۆ موحەمەد هاتووە، سروشە–وەحیە، نەك ئیلهامی شاعیرانە.

## سێیەم: خەتەری قورئان

هەندە نموونە لە قورئان و فەرموودەوە ناهێنین، هەرچەندە هەردووك سەرچاوەی باوەڕی ئێمەن، چونکە هەر خودی ئەو کەسانەی ڕەخنە لە قورئان و فەرموودە دەگرن باوەڕیان بەو دووە نییە!! خودا جگە لە قورئانی پیرۆز، بونەوەر و مرۆڤ خۆی لە بەر چاوی مرۆڤ داناوە تا بیر بکەنەوە. بونەوەر و مرۆڤ– نێر و مێ– دوو هۆکارن، کە موسلمان و نا–موسلمان وەك یەك بەشدارن قسەی لە سەر بکەن، چونکە هیچ کەسێك نییە کە باوەڕی بە هەبوونی ئەو دووە نەبێ! وێڕای ئەمەش، هەر مرۆڤێکی ژیر باوەڕی بەوە نییە ئەم بونەوەرە کە دەزگایەکی ئەلیکترۆنی گەورەیە لە خۆوە دروست

بووه !یان خالیقێکی نییه. شاره‌زووری به‌ر له سی سالّ له " ڕێکه‌وت له ته‌رازووی ژێریدا " باسی له ڕێکه‌وت کردووه، که له به‌رانبه‌ر پرۆسه‌ی ئافراندنی بونه‌وه‌ردا چه‌ند لاوازه ! هه‌ر ده‌لّێی سیزیفه به‌رانبه‌ر ئه‌و به‌رده گه‌وره‌ی هه‌لّیگرتووه هه‌رگیز پێی به سه‌ر چیا ناکه‌وێت !

خه‌ته‌ری قورئان له‌وه‌دایه، که ڕاستی ده‌لّێت. پیاوێکی موبه‌شیر به قوتابیه‌کانی ده‌لّێت: هه‌تا مه‌ککه و قورئان له دلّی موسلمان مابێ، ئێمه‌ی ته‌بشیری هیچمان به‌رانبه‌ر موسلمانان پێناکرێت " بلاشیر ده‌رباره‌ی کاریگه‌ری قورئان ده‌نووسێ: " ئه‌وه‌نده کتێبه ئاینیه‌کانی ڕۆژهه‌لات بینیووه، که‌م به قه‌د قورئان خه‌باتی هزری ئێمه‌ی ئاوا نیگه‌ران کردبێت، ئه‌وه ته‌نیا قورئانه داب و هزری ئێمه‌ی ئاوا نیگه‌ران کردووه." بۆ ڕۆژئاواییه‌کان مه‌سه‌له‌که هه‌ر نیگه‌رانی و ئالۆزی و هزر لێ تێکچوون نییه، به‌لکو قورئان وای لێکردووین هه‌ست به خه‌ته‌ری قورئان بکه‌ین! ! !نووسه‌ری " موت الغرب " ئاوا باسی مردنی ڕۆژئاوا ده‌کات، که ڕۆژهه‌لاتیه‌کان کاریگه‌ریان له سه‌ر ڕۆژئاوا هه‌یه، ئه‌ویش به دالدانی ڕۆژهه‌لاتیه‌کان له ده‌ستی ئه‌و دکتاتۆره‌کانی ڕۆژهه‌لات، که ده‌ولّه‌ته‌کانی ڕۆژئاوا دروستی کردوون، نه‌ك میلله‌ت خۆی ! !هه‌روه‌ها بوونی ئه‌و هه‌موو

موسلمانه له ڕۆژئاوا، به جۆرێك له هه‌ندێ وڵات بۆته ڕه‌وه‌ندێکی- جالیه‌یه‌کی- سه‌ربه‌خۆ، به قورئان بوونه‌ته خه‌ته‌رێکی گه‌وره له سه‌ر سیاسه‌ته‌کانی پیاوانی ده‌وڵه‌ت و که‌نیسه له ڕۆژئاوا. با هه‌ندێ غه‌ڵه‌ت حاڵی نه‌بن، قورئان له سه‌ر هیچ که‌سێك خه‌ته‌ر نییه، به‌ڵکو خۆی ڕه‌حمه‌ته.

جا با بزانین ئه‌وه پیاوانی ده‌وڵه‌ت و که‌نیسه‌ن سه‌رچاوه‌ی خه‌ته‌رن یان قورئان ؟؟دیاره ئه‌وانه‌ی ئه‌و قسانه ده‌که‌ن، وه‌ك قورئان خۆی سێ جار ده‌فه‌رموێ " ئه‌وانه به ڕاستی له توانای خودا شاره‌زا -ته‌واو نایناسن- نیین"

یه‌که‌م دابه‌شکردنی کوردستان ئه‌وان بوونه به ڕه‌سمی به پێی پلانێك دابه‌شیان کردووه یان قورئان ؟؟ ئێمه چاك ده‌زانین که سایکس و بیکۆ و سازانۆف ڕۆڵی سه‌ره‌کیان هه‌بووه له داڕژتنی پلانی دابه‌شکردنی کوردستانی عوسمانلی؟؟ ئه‌و دابه‌شکردنه‌وه چ کاریگه‌ریه‌کی ده‌روونی له سه‌ر تاکی کورد کردووه ! ! ئه‌رێ ڕێکه‌وتنامه‌ی لۆزان کێ به‌ستی و له کوێ به‌سترا ؟؟؟ ئه‌رێ ئه‌وه‌ی له کوردستان ناسیۆنالیستی کورد ده‌یکات سایکس-بیکۆی کوردی نییه و کاریگه‌ری له سه‌ر تاکی کورد له‌وه‌ی ڕۆژئاوا زیاتر نییه ؟!

## +سایکس-بیکۆی ناسیۆنالیستی کوردی

وەبزانم کەسێك نییە شارەزای یان گوێ ی لە مێژووی سایکس-بیکۆی ناسیۆنالیستی یان تەبشیری رۆژئاوا نە بوویێ؟؟ یان لە ماهیەتی سایکس-بیکۆی سیاسی نە گات ؟! من لەم بابەتەدا قسە لە سەر ئەم مەسەلەیە ناکەم، هەرچەندە لە سەر ئەو مەسەلەیەش رای خۆم هەیە! ئایین جیاوازی رۆڵی بنەڕەتی هەبووە ؟

دەسەڵاتی کوردی لە هەرێمی کوردساندا بە جۆرێکە هێندە لە راژەی کورد دا نییە وەك پێویست و چاوەڕێکراو !ئەوە نییە ئاخاوتنی من لە سەر دەسەڵاتی کوردیەوە لە سەرچاوەیەکی سیاسی جیاوەز و دژەوە سەرچاوەی نە گرتووە، بەڵکو لە عەقڵێکی جیاوەزەوە دروست بووە! بە حوکمی ئەوەی دەسەڵاتی کوردی بە موتلەقی دەسەڵاتێکی حزبی رێژەییە!! حیزب ئەوەندە هەژموونی سیاسی لە سەر بڕیارەکانی حکومەت هەیە، بە جۆرێك دەتوانین بڵێین حزب یەکسانە بە حکومەت، حکومەتیش یەکسان بێت بە حزب.چۆن وەختی خۆی دیگۆل دەیگوت: " من دەوڵەتی فەرەنسام، فەرەنسا منم " ئەدەبیاتی بەعسیش دەیگوت: " ئەگەر صدام شتێکی وت، ئەوا عیراق وتویەتی." یانی سیاسەتی بە

حیزبیکردنــی حکومـــەت کـــەلتوری حکومـــەتی کۆمۆنیـــستیە، فەرەنسیە، بەعسیە....کوشتنی هێز و هزری تاکە، خەتەرە لە سەر توانای تاکی بێ لایەن.

هـەردوو حیزبـی فـەرمانڕەوای کوردستان لـە سـاڵی ١٩٩٦ ەوە هەرێمی کوردستانیان جارێکی تـر دابـەش کردۆتـەوە: ناویـان نـاوە ناوچەی کەسك (سەوز) و ناوچـەی زەرد !! ئـەو دابەشـکردنە بـە جۆرێـك بـووە هـەتا خۆپیـشاندانەکانی هاوڵاتیـان لـە سـاڵی ٢٠١١ مۆرکێکی تا رادەیەك ناوچەگەری و حیزبەگەری ئـەو دابەشـکردنەی پێـوە دیـار بـووە !! ئـەوە شـازدە سـاڵە هـەموو کابینـەکانی کوردستان نەیتوانیوە ناوچەی سەوز و زەردی بەشێکی باشووری کوردستان بکەنەوە یەك!! ئێستاشی لە گەڵ دابێت بڕیارەکی سەوز لە ناوچەی زەرد جێ بە جێ ناکرێ، ئەگەر سەرۆکی سەوز سەرۆکی عیراقیش بێت !! بە پێچەوانەش بڕیارێکی زەرد لە ناوچـەی سـەوز پـەیڕەو نـاکرێ، ئەگـەر سـەرۆکی زەرد سـەرۆکی هـەموو باشووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی کوردی بێت!!

هەرچەندە ئـەم نووسـینە زۆر لـە سـەر ئـەم بابەتـە نـا دوێـت – چونکە بە حیزبی و نا حیزبی زۆری لـە سـەر وتـراوە و نووسـراوە–، بەڵکو لە سەر دابەشکردنێکی زۆر خەتەرناك قسەی خۆی دەکات!!

کە بە ڕای نووسەر، ئەگەر وا لێی بگەڕێین، زۆر ترسناکترە لە سایکس–بیکۆی ڕۆژئاوا و سایکس–بیکۆی سەرانی ڕۆژهەلات!!

دابەشکردنی دەسەلاتی کوردی لە سەر تاکەکانی نەتەوە ڕادەوەستێ، بە واتای هەژموونی سیاسی و سایکۆلۆژی لە سەر زۆربەی تاکی کورد دەبێت. ئەو جۆرە دابەشکردنەی دەسەلاتی کوردی هەر بە دەستی کورد بووە، کورد لە باشووری کوردستان دەکاتە دوو نەتەوەی جیاواز!! کەچی لە پاش چالدێران و زەهاب، ئەمە چەندین سەدەیە، بە فێلی مەزهەبی جیاواز هەتا ئایینی جودا، داگیرکەرانی کوردستانی گەورە نەیانتوانیوە تاکەکانی نەتەوە بکەنە دوو یان سێ نەتەوەی جیاواز!!! هەرچەندە باشووری کوردستان، ئەوەندەی ڕزگارکراوە!!، تەنیا سێ شارە، کەچی لە پەروەردەی ئەو سێ پارێزگایە سێ (زمانی) جیاواز دەخوێندرێت! لە پەروەردەی ئەو سێ پارێزگایە، لە جیاتی یەك زمانی ستاندەر وەك ئینگلیز و عەرەب، سێ زار و بنزاری جیاوازی کوردی دەخوێندرێت، بە مەش لە ئایندەیەکی نزیکدا سێ نەوەی لە یەکدی جیاواز لە نەتەوەیەك دروست دەبێت!!

مەسەلەکە دوور و نزیك پەیوەندی بە زمانی دایکەوە نییە، چونکە کورد هیچ کێشەیەکی لە گەڵ زمانی تورکمانی و سریانی

## زەردەشتی

زۆر لەو کۆلکە ڕۆشنبیرانەی لە ئیسلام هەلگەڕاونەتەوە، قسە لە سەر قورئـان دەکـەن، پەسـندی زەردەشـتی دەکـەن بـێ ئـەوەی مێژووی پیاوانی زەردەشتی دەرك پـێ بکـەن.ئایـا ئاڤێـستا کـۆنترە یان قورئان؟

زۆریـەی سەرچـاوەکان جـەخت لـە سـەر ئـەوە دەکـەن، کـە زەردەشتی لـە سـەردەمی میدیـەکان ٧٠٠-٥٤٩ پـێش زایـین پەیـدا بووە. هەندێ ژێدەر دیرۆکی دەرکـەوتنی زەردەشـت بـۆ ٦٥٠ پـێش مـیلاد دەگەڕێننـەوە.زەردەشـتی ٦٥٠ + ٦١١ = ١٢٦٦ سـاڵ پـێش قورئـان هـەبووە، کەواتـە ئاڤێـستا ١٢٦٦ سـاڵ پـێش قورئـان دابەزیوە.لەوەش زیاتر ئەسکەندەری مەکدۆنی دوای شەڕی ئـەربێلا -٣٣١ پێش میلاد- ئێرانی داگیرکرد، بـە قـسەی سـۆزانیەك ئاگری لە کەلتور و ئاییی ئێرانی بەردا.لەو ساتە ئاڤێستا لە نێو ئەو ئاگرە سووتا. ئەو ئاڤێستایەی ئێستا بەردەستە دروسـتکراوی دەسـەلاتی ساسانیە.

توخوا ئەوپەڕی مردنی عەقڵ و بیرکردنەوە نییە، کە دەقێکی ١٢٦٦ ساڵ بەر لە قورئان بکەیە مەنهەجی ژیان، لەوەش ترسناکتر، ئەو ئاڤێستایە دروستکراو بێت!

## مەسیحیەت

ئەگەر ئەو مێژووەی بۆ لە دایکبوونی مەسیح دانراوە ڕاست بێت، ئەوا مەسیحیەت حەوت سەدە لە قورئان کۆنترە: ٥٧١ ڕۆژی لە دایکبوونی حەزرەتی موحەمەد + ٤٠ ساڵ تەمەنی پێغەمبەر =٦١١ ساڵ ئینجیل لە قورئان کۆنترە! مەسیح بۆ نەتەوەیەکی دیارکراو هاتووە، کەواتە بوونە مەسیحی کورد، ڕەنج بە خەسارییە، چونکە کورد لە نێو هاوکێشەی مەسیحیەتدا جێی نابێتەوە.هەرچی موحەمەد پێغەمبەرە، پێغەمبەرێکی جیهانییە، خۆی هەر نەژادێکی هەبێت، پەیامەکەی جیهانییە و بۆ هەموو نەتەوەکانە.

کەواتە کۆنێتی قورئان درۆیەکی هەڵخەڵەتێنەرە، نازانم چۆن مرۆڤ چارەنووسی خۆی دەداتە دەست دەقێکی شێوێندراو؟؟ لە دەقێکی دروست و ساغ هەڵدێت؟

## پێنجەم: کەلتورکوژی

ئیسلام بەوە تاوانبار دەکرێ، کە دینێکە کار لە سەر کوشتنی کەلتوری دینی دی دەکا.بزانین ئەو بیرۆکە لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە:

### ئەسکەندەری مەکدۆنی سوتاندنی ئاڤێستا

هەر چۆنێ ناسنامەیەك بۆ ئاڤێستا دادەنێن گرینگ نییە، بە واتای ئاسمانی بێ، قورئان قەبوڵیەتی، زەمینیێ بێ، هەر قەبوڵیەتی چونکە هیچیان دژ بە گوتاری قورئان نیین، لە هەردوو ڕووەوە قورئان باوەڕی وایە کە پاش دابەزینی قورئان دەبێ تەنیا ئیش بە قورئان بکرێت.سیکیولەری کورد وەك سیکیولەری عەرەب ئەفسانەی ئەوە بلاّودەکاتەوە، کە لەشکری ئیسلام ئاڤێستا سوتاندووە!! ئەو بانگاشەیە دوور لە ڕەوتی ڕوداوی مێژووە.لە ڕاستیدا ئەسکەندەری مەکدۆنی دوای شەڕی ئەربێلا ٣٣١ پێش میلاد، بە واتای ٣٣١+٦٢٨ =٩٥٩ ساڵ پێش هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان، ئاڤێستا بە دەستی ئەسکەندەر سووتابوو.

## هۆلاکۆ کەلتوری بەغدا دەسووتێنێت

بەغدا لە سەردەمی عەباسیەکان پایتەختی سیاسی ئیسلامی بوو. لە سەردەمی لاوازبوونی دەسەلاتی ئیسلامی، بە هۆی رابواردن و خۆشگوزەرانیەوە. بەلام لە وەختەکانی دی موسلمانان گەورەترین کتێبخانەیان دروستکردبوو، کتێبی لاتینی و گریسی و عەرەبی تێدابوو، هۆلاکۆ پاش گرتنی بەغدا ئەو هەموو کەلتورەی لە ئاوی دەجلە کرد!

## مەسیحیەکان کتێبخانەی قورتبە دەسوتێنن

ئەگەر فەلەکان دەسەلاتیان هەبێ، قەبولی جولەکایەتی و ئیسلام ناکەن، پرۆسەی دادگای پشکنین باشترین بەلگەیە هەروەها لە سەردەمی نوێش شەڕی بۆسنا و ئەلبانیا و چیچان بەلگەن لە سەر هۆڤانیەتی گاورەکان.

کتێبخانەی قورتبە چی لە کتێبخانەی بەغدا کەمتر نەبوو، بەلام مەسیحیەکان هەموویان سووتاند!

جا سیکیولەری کورد ئەو کەلتوری کتێبکوژی دەخاتە ملی ئیسلامەوە تەنیا بۆ ناشرینکردنی ئیسلام!

ئه‌وسا مه‌سه‌له‌ی (نه‌ته‌وه)یان، وه پێش (ئومه‌ی ئیسلامی) ئێخست‌و هه‌ریه‌کێ باوه‌ڕی به‌و تێزه‌ی ئه‌وان نه بووبێ به (شعوبی) ناویان ده‌برد هه‌روه‌ها (غه‌یره عه‌ره‌ب) یان به (مه‌والی) داده‌نا. له‌ناو ده‌سه‌ڵاتیش په‌یڕه‌وی تیۆری (اهل الثقة قبل اهل الکفاء) یان ده‌کرد! له‌و نێوه، چه‌ند یاخی بوونێك له دژی ئه‌و جۆره ده‌سه‌ڵاته نه‌ك دینه‌که به‌رپابوون – هه‌تا ساڵی ٧٥٤ کۆتایی به‌و ده‌سه‌ڵاته هات! له ناو ئه‌مپراتۆرییه‌تی عه‌باسی و عوسمانیش شێوازی حوکمڕانی نه‌گه‌ڕاوه بۆ "شووره‌یی"...له سه‌ر ئه‌و مێژووه و که‌لتوره‌وه

به‌شێك له سیکۆلاریزمی کوردی، سه‌ره‌تای حوکمی ئه‌مه‌وی به ده‌رکه‌وتنی (عه‌لمانییه‌تی ئیسلامیی) ناوده‌به‌ن. ئه‌م (ڕا) یه‌ش دووباره‌کردنه‌وه‌ی ڕای ڕۆژهه‌لاتناسه‌کان و (ڕا) یه‌که‌ی (عه‌لی حه‌رب)ه. وێناکردنی ده‌سه‌ڵاتی ئیسلامی به‌ده‌سه‌ڵاتی که‌هنووتی که‌نیسا زۆرێك له ڕۆژهه‌ڵاتناس و عه‌لمانییه‌کانی ڕۆژهه‌ڵاتی به ئاراسته‌یه‌ك دابردووه که ئایه‌تی (شاورهم في الأمر) و (میساقی مدینة – که ته‌واوی مافی هاوڵاتیبوونی) بۆ هه‌مووان له‌خۆگرتبوو، بانگه‌شه بۆ عه‌لمانییه‌تی ئیسلامی بکه‌ن، به‌ڵام ئه‌مه ئیسلامه که مامه‌ڵه له‌گه‌ڵ (دین) و (دنیا) ده‌کات و ده‌سه‌ڵاتی که‌هنووتی له

ده‌وڵه‌ت ڕه‌تده‌کاته‌وه‌و ڕووبه‌رێکی گرنگ له‌به‌رده‌م زه‌ن و هزر و بیرکردنه‌وه‌ی مرۆڤ والآ ده‌کات که به‌شداریی له شه‌ریعه‌ت و فیقهی ئیسلامی!

بزاڤی سیکۆلاریزمی کوردی – که هێشتا خاوه‌ن ئۆرگان و ناسنامه‌و ڕوئیای خۆی نییه و ده‌رهاوێشته‌ی ئه‌زموون و ئه‌ده‌بیاتی حیزبی ئایدیۆلۆژی کوردی سه‌رده‌می ململانێی شاخه..هه‌روه‌ك چۆن حیزب ڕه‌خنه‌ی له عه‌قڵ و که‌لتوری ئیسلامییه‌وه ده‌گرت و شێوه‌یه‌کی ئه‌فسانه‌یی و ئوستوریی له زه‌ین و هزری موریده‌کانی ده‌چاند...له مه‌ش زیاتر مه‌سه‌له ئایدیۆلۆژییه‌کان فاکته‌ری لێکهه‌لوه‌شانه‌وه‌ی حیزبی عه‌لمانی –مارکسی کوردی بوون...له ناو ئه‌زمونی حوکمڕانی کوردیا حیزبی لائیکی کوردی له‌به‌ر چه‌ند هۆیه‌ك نه‌یتوانی له سه‌ر پرۆژه مارکسیه‌که‌ی به‌رده‌وام بێ و ڕه‌خنه له ئیسلام بگرێ: هه‌ره‌سی شیوعیه‌ت له سۆڤیه‌ت و ولاته سۆشیالیسته‌کانی ئه‌وروپای ڕۆژهه‌لات هۆکاری بنه‌ڕه‌تی لاوازبوونی پرۆژه‌ی حیزبی سیکیۆلاریزمی کوردی بوو هه‌روه‌ها، سیسته‌می کۆمه‌لگای شار وه‌ك شاخ نییه حیزب ده‌یزانی ناتوانێ چیتر کار له سه‌ر ئه‌و پرۆژه سیکیۆلاریزمییه بکات... لێره ده‌وری ڕاسته‌وخۆی حیزبی مارکسی – کۆمۆنیستی له پرۆژه‌که ته‌واو بوو! ! پرۆژه‌که

ته‌سلیم به‌ ئه‌و نوسه‌رانه‌ی به‌ ناو ده‌ره‌وه‌ی حیزب کرا و بودجه‌یه‌کی چه‌ور بۆ ئه‌و پرۆژه کۆنه نوێیه ته‌رخانکرا، به‌ جۆرێ له دوای بالاده‌ستی ئه‌مریکا له ناوچه‌که‌دا، چه‌ند رۆژنامه و گۆڤارێك ته‌رخان کران بۆ ره‌خنه گرتن له ئیسلام و دیارده‌ی ئیسلامی، ئه‌و جۆره میدیایه‌ش، ناسراوه به میدیای سێبه‌ر، که به شێوه‌یه‌کی ناراسته‌وخۆ کار بۆ حیزبی سیکیوله‌ری کوردی ده‌کات.

به‌ره‌ی به ناو رۆشناکبیری سیکیۆلاریزمی کوردی له چه‌ند رێگایه‌کی تر، جیاوازتر له حیزب ده‌یه‌وێ (ره‌خنه) له قورئان بگرێ ! ئه‌و جۆره گوتاره‌ش لێڵی و تارماییه‌کی زۆری له مه‌ناوی خۆی هه‌لگرتووه. ئه‌و ناراسته نا–روونه‌ی ئه‌و گرووپه، گوتاری به‌شێك له حیزبی ئیسلامیی کوردیشی تووشی نا–روونی کردووه. ئه‌وان، به‌زۆری، قسه له‌سه‌ر شه‌ریعه‌تی ئیسلام و باری که‌سێتی و شه‌ریعه‌تی ئیسلام و ده‌ستووری هه‌رێم و چه‌ند ژنی ده‌که‌ن.و ته‌ئویلکرنی هه‌ندێ ئایه‌ت به پێی شه‌نگسته‌کانی مێژووگه‌رایی ئه‌ره‌کۆن و هێرمۆنتیکای ئه‌بو زێده‌وه....هتد ده‌خوێننه‌وه، هه‌موو ئه‌مانه‌ش به شێوه‌یه‌کی ناراسته‌وخۆ (بانگه‌شه‌کانی) ئه‌ره‌کۆن دووباره ده‌که‌نه‌وه.

شەریعەتی ئیسلامی بە گوێرەی لێکدانەوەی مەزهەبی داڕێژراوە ئەمەش وایکردووە بوارێکی زۆر لە هەموو شوێنکاتێکدا لەبەردەم عەقلی سەلیمی مرۆڤێکی سەلیم والابێ. یاسای باری کەسایەتی عێراقی بە زۆری لەسەر بنەماکانی ئیسلام داڕێژراوە و دەستووری هەرێمیش لەبەندی شەشەم بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی بە سەرچاوەیەکی سەرەکی یاسادانان داناوە.

چەسپاندنی ئەم برگەیە لە حکوومەتی عەلمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی بەغدا و کاریگەری ئیسلامییەکانی کوردستان!

گروپی سیکولاریزمی کوردی ئەو بڕیارەی حکوومەتی (عەلمانی مەدەنی) کوردی بە (هەڕەشە) لەسەر ئازادییە ڕەهاکانی خۆیان دادەنێن و هەروەها وەك ئەرەگۆن بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە چۆن دەبێ شەریعەت لە یاسا و دەستووری وڵات جێگیر بکرێ ؟! لەو بارەیەوە، ئەو گرووپە خەریکی (ئیمزا کۆکردنەوەی) خەڵکی عەوام و کەسانی وەك خۆیان بوون بۆ ئەوەی ئەوە نەچەسپێ !! بەڵام بزاڤەکەیان هیچی پێنەکرا !!!

چه‌ند ژنی، یه‌کێ له‌و مه‌سه‌لانه‌یه که هه‌ردوو عه‌لمانییه‌تی کوردی زۆر کاری له‌سه‌ر ده‌که‌ن و ئه‌و ڕێپێدانه‌ی (خودا له ئایه‌تی سێ ی سوره‌تی (النساء) " یان به ناهه‌ق و سه‌ردەم به‌سه‌ر چوو ناو ده‌به‌ن یان بۆ چه‌واشه‌کردنی خه‌ڵکی عه‌قڵ ده‌ڵێن چه‌ند ژنی ته‌نها به پێغه‌مبه‌ر و سه‌حابه پەیڕەو ده‌کرێ!!!. ئه‌مه‌ش هه‌ر دووباره‌کردنه‌وه‌ی ڕایه‌کانی ئه‌ره‌گۆن و نه‌سر حامد ئه‌بو زێده، که هه‌وڵیان ده‌دا له په‌نای (تیۆری ڕه‌خنه‌ی مێژووگه‌رایی) و هه‌رمۆنتیکا شکۆ و پیرۆزی قورئان نه‌هێڵن و خوێندنه‌وه‌ی تری بۆ بکه‌ن به‌وه‌ی ماناو مه‌دلووله‌کانی قورئان وه‌ك هه‌ر ده‌قێکی ته‌ورات و ئینجیل به گوێره‌ی زه‌مان و مه‌کان ده‌گۆڕێن !

ئه‌و ته‌ئویل کردنه، ده‌سه‌ڵاتی قورئان په‌ك ده‌خات، چونکه ئه‌و ئایه‌ته به هیچ ئایه‌تێکی دی قورئان (نه‌سخ) نه‌کراوه. ئه‌فسوس به‌شێك له ڕۆناکبیرانی حیزبی ئیسلامیش (شه‌رم) له‌م ئایه‌ته ده‌که‌ن ! هه‌تا په‌روه‌رده‌ی به‌شێك له خوشکانی ئیسلامیش به‌ده‌ر نییه له کاریگه‌ری دیماگۆژیه‌تی سیکۆلاریزمی کوردی !

نووسه‌ری (ئۆقیانووسێك له تاوان) له چاوپێکه‌وتنێکدا ده‌ڵێ دیارده‌ی له‌شفرۆشی زۆربه‌ی شاره‌کانی کوردستانی گرتۆته‌وه به جۆرێ ته‌نها له هه‌ولێر و سلێمانی زیاتر له دوو هه‌زار (له‌شفرۆشگه)

هەن !! لە بەرانبەر ئەوە، بزاڤی سیکۆلاریزمی کوردی، دەسەلاتی عەلمانی کوردی تاوانبار دەکات بەوەی بەشێك لە بەرپرسەکانیان لە پەتای ئەو دیاردەوەن !

باوەڕ ناکەم هیچ ئیسلامییەك گومانی لەو فەرموودەی پێغەمبەر (سەلامە خوای لەسەر) هەبێ کە دەفەرموێ "باشترین سەردەم، سەردەمی منە، پاشان سەردەمی دوای مـن،...." قورئانیش لەبارەی ئەوانەوە دەفەرموێ "رضي الله عنهم ورضوا عنه". لەو سێ سەردەمەدا: سەردەمی پێغەمبەر، سەردمی سەحابە، سەردەمی تابعین – دیاردەی چەند ژنی زۆریەی کۆمەلگای ئیسلامی گرتبوەوە هیچ ئاریشەیەکی کۆمەلایەتیش لە ئارادا نەبووە، کە هەرەشە بێ لەسەر ئافرەت وەك ئەمڕۆ لەسایەی سیکۆلاریزم و عەلمانیەتی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات خەریکە هەموو ڕێزو شکۆ و قەدرێك لە ئافرەت دەسەنرێتەوە !! نازانم ئەو بێڕێزییە سێکسییەی لە فیلم و ڕێکلام و دەزگای ڕاگەیاندنی ڕۆژئاوا بە ئافرەت دەکرێ... مافە دەدرێ بە ئافرەت ؟!

ئەم (کۆششە) ی سیکۆلاریزمی کوردی، بێ دەنگی و شەرمی بەشێك لە ئیسلامیی کوردی ناڕاستەوخۆ کوشتنی قودسیەت و حەتمیەتی قورئان ناگەیەنێ ؟! یان هەر ڕێك تەسلیم بوون بە

بانگگەشەکانی ئەرەگۆن و ئەبو زێد ناگەیەنێ بەوەی دەبێ (مێژوویيەتی) قورئان بچەسپێ ؟!

هەموو ئەلتەرناتیڤەکانی چەند ژنی: مانەوەی قەیرە و کوشتنی حەزی ئەو ئافرەتانە لە سێکسی شەرعی و پەرەسەندنی (زەواجی عورفی) و (زەواجی موتعە) و (گێرلفرێندی ڕۆژئاوایی) و (دۆست و قل و یار) ی کوردی.... شەرمەزاری نیین بۆ مرۆڤایەتی ئافرەت ؟! ئەوە سیکۆلاریزمە، لای ئاساییە لەشفرۆشی هەبێ هەتا لەهەندێ ڕۆژنامە کردنەوەی (مەلها) بە پێویستییەك دەزانن بۆ دامرکاندنەوەی شەهوەی پیاو !! هەتا ئافرەتێکی سیکۆلار دەڵێ: ئەو پیاوانەی لەدەرەوە سێکس دەکەن، ئاریشەیان لەماڵەوە لەگەڵ ژنەکانیان کەمترە یان ئافرەتێکی مارکسی لە ئێن ئارِ تی دەڵێت: " بەستنەوەی ئازادی سێکسی ژن بە عاداتی کۆمەڵگاوە، ڕێگرتنە لە بەردەم حەز و ویستی ژن هەروەها بوونی هەر یاسایەك بریتیە لە تەسککردنەوەی ئازادی—بە کورتی من لەگەڵ ئازادی بێ قەید و شەرتم !" نازانم لە عەقلی ئەوانەدا، هاوسەرگیری تەنها بریتییە لە تێرکردنی ئارەزووە سێکسییەکانی پیاو ؟ ئەدی ژن ؟! ئەویش وەك پیاو (لەشکێ) ڕێی پێ بدرێ لەشی لە ڕقی خیانەتی زەوجی پیاوەکەی هەراج بکات ؟!

بیرمەنددەکانی ڕۆژئاوا مەندەهۆشن بە گیانی هاوسەرگیری کوردی، هەتا دەسەڵاتدارێکی ئەورووپا لە دیدارێکی لەگەڵ ڕۆژنامەی (ڕووداو) بە ئاشکرا وتوویەتی ئەوەی ئێمە بە خۆمان کرد ئێوە نەیکەن !!

ئەلتەرناتیڤی ئەو (بەشە) ی ئیسلامیی کوردیش چی یە کە شەرم لە ئایەت چەند ژنی دەکات ؟! زەواجی فرێندە ؟ زەواجی مسیارە ؟!

لە لایەکی تر، بزاڤی سیکۆلاریزمی کوردی دەیەوێ وەك ئەرەگۆن و ئەبو زێد و حەسەن حەنەفی....هتد کار لەسەر چیرۆکەکانی قورئان بکات و ئەو چیرۆکانە بە ئەفسانە و ئەستوورە ناو ببات. ئەمەش وەنەبێ شتێکی نوێ بێ، قورئان پێش ڕۆژهەلاتناسەکانیش قسەی قوڕەیشییەکانی لەم بارەیەوە ڕاگەیاندووە.

ئەو باسانەی ئەوان دەیکەن هیچی زادەو بیرکردنەوەو دۆزینەوەی عەقڵی خۆیان نییە، بەڵکو چەند نووسەرێکی عەلمانی عەرەبی بانگگەشەی ئەوە دەکەن، کە ئەو چیرۆکانەی قورئان لە (تەورات) یش دا هەن و قورئان لەوانی وەرگرتووە !! هەروەها

وەك ئــەرەگۆن دەڵێــت ئەوانــە (حیکایــەتن) ئەســتوورپین.... باسکردنی بەشێك لە چیرۆکەکانی ناو تەورات لە قورئانـدا دەلالـەتی یەك گوتـاری و یـەك سەرچـاوەی ئایینـە، بـەڵام بـەحوکمی ئـەوەی تـەورات گۆڕانکـاری تێـدا کـراوە، چـیرۆکەکانیش بـە شـێوەیەك داڕێژراونەتـەوە بـە هـیچ جـۆرێ سیماو ئـەدگاری ئاسمانیـان پێـوە نەماوە !! هـەروەها ئـەرەگۆن و مارکسییەکان بـە هـۆی میتـۆدی ڕەخنەی مێژوویی و ئەنسرۆپۆلۆژیای ئایین و کۆمەڵناسی مەعریفـەو هەڵوەشاندنەوە ئەو دەقانەی (تـەورات)یـان وەك دەقێکـی ئـەدەبی یــان مێــژوویی هێــشتۆتەوە، کــە هــیچ قودســیەتێکی بــۆ پێغەمبەرەکانیش نەهێشتۆتەوە، بەڵام ئەوەی بەوردی لە تـەکنیکی گێڕانـەوە Narration Techniquesو بینـا و سترەکـچەری چیرۆکەکان و پیمـە دیـار و نادیارەکـانی ( Overt and covert themes) ی قورئـان ورد بێتـەوە بـۆی دەردەکـەوێ ئـەو شـێوە داڕشـتنە، داڕشـتنی مـرۆڤ نییـە و ڕووداو (event) و تـان و پـۆ (plot) یـەکانی لەگـەڵ هـیچ چـیرۆکێکی (تـەورات) و حەکایـەت و ئەفسانەی گەلان تێك ناکاتەوە !!

سیکیولەریزمبوونی حیزبی کوردی مێژوویکی کۆنی هەیە وا خەریکە بەرەو سەدەیەك دەچێت. چەپبوون و عەلمانیبوون بیرۆکەی ئەمڕۆ نییە.

لەم نووسینەدا لە بریتی عەلمانیەت بە زۆری لایسیزم یان سیکیولاریزمی ڕۆژئاوا بەکار دەهێنم. سیکیولاریزم لە ئەورووپا بە واتای "دنیایی، نادینی" بەکار دەهێنن، کەچی عەلمانیەت لە ڕۆژهەلات بە واتای "دنیایی و نا-دینی"، کە واتای دروستی خۆیەتی، بەکاری نامێنن، بەلکو واتاکەی بە ئارەزووی خۆیان دەگۆڕن و واتایەکی دی بۆ زیاد دەکەن..

لە لایەکی ترە، هەروەك ناونیشانەکە پێشنیاز دەکات، پێم خۆشە لە سترەکچەری سیکیولاریزمی ڕۆژهەلاتی بدوێم وباسی کاریگەری سیکیولاریزمی رۆژئاوا لە سەر فراژووبوونی ئەم چەمکە لە ئەدەبیاتی سیاسی کوردی بکەم. بە حوکمی ئەوەی حزبی کوردیش هەر لە سەر بنەماکانی ئەو جۆرە سیکیولاریزمە دامەزراوەو ڕوئیاو پەیامیشی هەر زیاتر کۆپی ودێژەپێدەری ئەوانە، لەم بوارەش، کە قسەی لەسەر کراوە بۆیە نوسینەکە لەم چوارچێوەیە دەرناچێ و ڕویەرەکەی هەرئەوەندە دەبێ، نەك شامیل و هەمەلایەن بێ و باسی ترسناکی ئەو بیرۆکە لە رەوتی حزبی کوردی سیکیولەر دەکەم.

## سیکیولاریزم و ئاریشەی زاراوە لە ڕۆژهەڵاتدا

وا دەخوازی زیاتر لە سەر چەمکی سیکیولاریزم لە باشووری کوردستان تاوتوێ بکەم، چونکە جگە لەوەی زێدەری زۆر بەڵای کورد بووە، نیفاقێکی سیاسی لە وڵات دروستکردووە.

ڕۆشەنبیر و حزبی ڕۆژهەڵاتی کێشەی ڕاگەیاندنی ناسنامە یەکێ لە ئەدگارە بنەڕەتیەکانی (ئەوە).ناتوانێ لە (نیفاقی سیاسی) (نیفاقی کۆمەڵایەتی) و (نیفاقی ئاینی) ڕزگاری ببێ، چونکە (مانەوەی) و (هەبونی) وابەستەی ئەو حاڵەتەن! ناتوانێ وەك سیکولەری ڕۆژئاوا لەو حاڵەتە ڕزگاری ببێ! ڕونتر و ڕاشکاوانە تر بێژین، ئەو خوێندەوار و قەڵەم بەدەست و شەهادەدارانەی ڕۆژهەڵات ئەوانەی دەیانەوێ لە دەرەوەی هەژمونی دین و دونیا وبونیای دین، بە تایبەتی ئیسلام بژین هەر (دەنگ) یان (جورئەت) ناکەن تەواو ئەوفەلسەفە سیاسیە، یان ئەو ئایدۆلۆژیا نادینیەکەی باوەڕیان پێ یە بە دروستی گوزارشتی لێبەکەن.هەرچەندە هەندێکی کەم هەن نە گوێی ڕاستی وەردەگری، نە زمانیان بۆ ڕاستی قورئان بە کاردەهێنن وە نە مێشکیان بۆ وەرگرتنی ڕاستی بە کاردەهێنن !

ڕۆژئاوایه‌ك ده‌ڵێ ئه‌وانه وه‌ك بۆق وان هه‌ر (قیڕه‌یان) دێت، هه‌ركه لێیان نزیك ده‌بیه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی بزانی چی یان ده‌وێ (بێ ده‌نگ) ده‌بن.ئه‌و جۆره ڕۆشنبیرانه له پارتی سیاسی خراپترن، چونكه هه‌ر ج نه‌بێ ناسنامه‌یه‌كی ڕوونیان نییه !!

هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌و شه‌نگست و بنه‌مایانه هه‌موو هزر و ئایدۆلۆژیاو فه‌لسه‌فه‌یه‌كی سیاسی ڕۆژئاوایی به (لێڵ)ی له ڕۆژهه‌ڵات قسه‌ی له سه‌ر ده‌كه‌ن.

بیتن و تێڕوانینی ڕۆژهه‌ڵات و ڕۆژئاوا وه‌ك یه‌ك نه‌كارێكی ئه‌كادیمیه نه ڕوئیایه‌كی دروسته، چونكه ئه‌و (دووه) ته‌ولو پڕ تارماییه له یه‌ك جودان، هه‌رچه‌نده له بنه‌ڕه‌تدا یه‌كن، نزیك یه‌كن! له‌لایه‌ك تیۆرداڕێژه‌رانی ڕۆژئاوا وا ڕۆژهه‌ڵات و قورئان بۆ تاكه‌كانی خۆیان وێنا ده‌كه‌ن ، كه ئه‌و دووه، به تایبه‌تی قورئان، ده‌بێ تاكی ڕۆژهه‌ڵاتی هه‌ر له ململانێ و به‌رپاكردنی توند و تیژی دابێ ! پیلانه‌كه و تۆمه‌ته‌كه له سه‌ر خۆیان راده‌كه‌ن و ده‌یخه‌نه‌وه ملی قورئانه‌وه !

بۆ ئه‌وه‌ی له چوارچێوه‌ی ناونیشانه‌كه‌وه ده‌رنه‌چین، با هه‌ر له سیكۆلاریزمی حیزبی كوردی بدوێین. له ڕۆژئاوا به‌ڕاشكاوی له ڕووی

زاراوە و چەمك و زمانەوانیەوە دان بەوە دەنێنن، کە سیکۆلاریزم بزاڤێکی نا دینیە -(فەرهەنگی ئۆکسفۆرددا)ئاوا ڕاڤەی زاراوەکە دەکات: دنیایی، مادی، نائاییینی، حکومەتی دژ بە کەنیسە... ، هەروەها دەربارەی زاراوەکە هاتووە: بزاڤێکی جڤاکیە ئامانجی گۆڕینی ڕەوتی بایەخدانی خەڵکە لە بایەخدان بە (ئاخیرەت وقیامەت) بۆ بایەخدان بە دنیا دەگەیەنێت! لەوێ (دین) و (پیاوی دین) و (هەژمونی دین) و (پەیوەندی پیاوانی دین) و (دەسەڵاتی سیاسی) وڵات، گەورە ترین هەڕەشە بوون لە زات و ڕوئیا و هزری مرۆڤەوە ـ لەوێ کۆمەڵێك هۆکار وەك هۆکاری هزری و سیاسی و و شارستانی و کۆمەڵایەتی و ئابوری حازر بوون بۆ ئەوەی زانا و ڕۆناکبیر و سیاسەتمەدارانی ڕۆژئاوا پشت لە کەنیسە و دام و دەزگای بکەن و حکومەت بە بونیاتی نادینی دامەزرێنن!

بێ گومان ئەو هۆکارانە لە ڕۆژهەڵات دەرنەکەوتوون بۆ ئەوەی لە ڕۆژهەلات شۆڕشێکی سیکۆلاریزمی بەرپابکرێ. ئەمە وەنەبێ ڕای کەسانی دەرەوەی بازنەی سیکۆلاریزم بێ، بەڵکو هەتا لە ناو توێژەرانی ئەو بوارەش ڕایەکی ئەوها هەیە، پڕە لە ئامازە بە ڕای علی حەرب و محمدئەرکۆن و حەسەن حەنەفی....هتد. ئەو سێ یە باوەڕیان وایە بنەماکانی سیکۆلاریزم لە ئیسلام دا هەن، علی حەرب

لە (نقدالحقیقە) بانگەشەی ئەوە دەکات، کە لە سەردەمی دەوڵەتی مەدینــەوە بنــەماکانی (ســیکیولاریزمی) لــە گوتــاری ئیسلامی دەرکەوتون.ئیسلام هەڵگری کۆمەڵێك واتــاو دەلــەلاتی جیــاوازە لــە هەناوی خۆشیدا شتێك لە عەلمانیەتی هەڵگرتوە.

محمد ئەرکۆن هەوڵی دەدا لە دەقە پیرۆزەکاندا هەنــدێ ئــەدگارو ســیما بدۆزێتــەوە بــۆ ئــەوەی ڕاڤــە و تــەئویلێکی (عــەلمانیبونی) ئیسلامی پــێ بکــات.ئــەرەکۆن لــە (الفكــر الإســلامي قرئــأة العلميــة) دەڵێت: عەلمانیەت لە هەناوی قورئــان و ئــەزمونی مەدینــەدا بــوونی هەیە، هەروەها لە دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی دەوڵــەتی عــەلمانی بون نەك ئاینی، لە لایەکی تر بە حکومی ئــەوەی هــزری ئیسلامی و شــەریعەت و فقهــی ئیــسلامی زادەی بیرکردنــەوە و خوێندەنــەوە و تێڕوانینی مرۆڤن بۆ هــەردوو دەقــی قورئــان و فــەرمودە، بۆیــە لــە دیدگای ئیسلامدا، بــە پێــچەوانەی ئینجیــل، مــرۆڤ بەشــدارە لــە شرۆڤەکردن و بڕیــاردان. هــەروەها هــەر چوار مەزهــەبی ســوونی و چەند مەزهەبی شیعە بەڵگەن لــە یاســاغ نــەکردنی عــەقڵی مــرۆڤ لە خوێندنــەوە و تێگەیــشتنی دەق و تیــۆری قیــاس بــۆ دەرەوەی دەق!

ئه‌وانه توێژه‌رێکی وه‌ك حه‌سه‌ن حه‌نفیان وا لێکردوه له کتێبی (الإسلام لا یحتاج علمانیة غربیة) بنوسێ: " شه‌ریعه‌تی ئیسلامی شه‌ریعه‌رتێکی وه‌زعیه– ده‌ستکردی مرۆڤه–و له سه‌ربنه‌مای به‌دیهێنانی به‌رژه‌وه‌ندیه گشتیه‌کان، که تایبه‌تمه‌ندی شه‌ریعه‌تن: (زه‌رورات، حاجیات، ته‌حسینات) دامه‌زراوه !" عه‌لمانیه‌کانیش بۆ به‌رجه‌سته کردنی ئه‌مانه کارده‌که‌ن، به‌ڵام له شارستانیه‌تی خۆرئاوای وه‌رده‌گرن نه‌ك شه‌ریعه‌تی ئیسلامی."

ئه‌م جۆره تێروانینه بۆ هه‌بوونی بنه‌ماکانی سیکۆلاریزم له قورئان و ئه‌زمونی ئیسلامدا خۆی له‌خویدا نیفاقێکی سیاسیه، چونکه ئیسلام دین و دونیایه، حوکمی ئیسلامی حوکمێکی دینی که‌هنوتی نییه‌و هیچ حوکمڕانێك (پیرۆز) نیه دنیاو به‌شه‌کانی دونیا له دین جودا ناکرێنه‌وه و ئه‌و (دونیا)یه‌ی له قورئاندا وێناکراوه وه‌ك ئه‌و (دنیا)یه‌ی سیکۆلاریزم نییه، له‌م ڕوانگه‌وه هه‌ر لێڵی و نیفاقه‌که‌ی ڕۆشه‌نبیری ئاینی ڕۆژهه‌ڵاتی ده‌رده‌که‌وێ، که ده‌یه‌وێ له هه‌ردوو (به‌ر–لایه‌ن) بخوات.

هه‌روه‌ك چۆن هه‌موو (عه‌لمانیه‌کانی) ڕۆژئاوا وه‌ك یه‌ك نین، ئه‌وانه‌ی ڕۆژهه‌ڵاتیش هه‌روان، به‌ڵام ئه‌وه‌نده هه‌یه، جیاوازی ئه‌و دووه له جۆری حکومه‌ته، ئه‌وانی رۆژئاوا سیکوله‌ری هه‌موویین،

بەڵام سیکیولاریزمەکانی لای ئێمە(بەشەکین). حکومەتەکانی ڕۆژئاوا لە سەر بنەمایەکی فەلسەفی و پێکهاتەی تەکنیکی و کەلتوری و ئاینیەوە داڕێژراون، هەرچی ئەوانەی ڕۆژهەڵاتن بە باشووری کوردستانەوەش لە سەر بنەمای نیفاقی سیاسی و غیابی ناسنامە دامەزراون !

## حزبی کوردی و ئەزمونی سیکۆلارزمی

بیرۆکەی حیزب دروستکردن، بیرۆکەیەکی ڕۆژئاواییە، ئامانجی سەرەکی ئەو دیاردەیە هەوڵدانێك بوە بۆ ئەوەی ڕۆژئاوا لە ڕێگایەکی ترەوە هەژمونی بەسەر ڕۆژهەڵاتەوە هەبێ، کورد زیاتر لە ئەزمونی حیزب دروست کردن زیاتر هەر لاسایی ئەزمونی نەتەوە باڵاکانی کوردستانی داگیرکراو وەك عەرەب و فارس و تورکی کردۆتەوە.

یەکەم بەشداری چالاکی کوردی لە حیزبی نەتەوەیی غەیرە کوردی دابووە، گروپی ئیتحادو تەرەقی و گەنجە تورکەکان لە پاریس و ئەستەمبۆل چەند کوردێکی وەك: عبداللە جەودەتو ئیسحاق سکوتلی ناویان دێت.

دکتۆر عبداللە جەودەت یەکێ لەو کوردە بەرایانەی ناو کاری حیزبی سیکیولاریزمە، دەتوانین ئەو بە یەکەم سیکولەری کورد دابنێین، کە تەواو لە ژێر کاریگەری ئەزمونی ڕۆژئاواو مارکسیەت دابووە لە باکوری کوردستان. ئەو دەرفەتە لە بەردەم کەسانی وەك دکتۆر عبداللە جەودەت دروست نەبوو، کە بتوانێ پەرە بە هزرو ئایدۆلۆژیایی عەلمانیەت –سیکولاریزم – نائاینی لە باکووری کوردستان و تورکیا بدات.

ئەو حزبە کوردیانەی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە باکووری کوردستان دروست بوون، وەك جەمعیەتی تەعالی کوردستان، پارتی دیموکراتی کورد، کۆمەڵەی ئازادی، کۆمەڵەی خۆیبون خاوەن فەلسەفەیەکی سیاسی ڕون نەبوون، ڕاستە ئەوانە (ئاینی) نەبوون، بەڵام (عەلمانی)یش نەبوون. هۆیەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵ و هەژمونی سەرکردە کلاسیکەکان و بنەماڵە دیارەکانی نێو بزاڤی ڕزگاریخوازی کوردی! کێشەکە لەو بازنەیە دەخولایەوە هەتا دامەزرانی حیزبی شیوعی عیراقی و چوونی هەندێ کوردی سیکیولەر بۆ ناو ئۆرگانی ئەو حیزبە.

# دامەزراندنی حزبی شیوعی عێراقی

سەرەتای دروستبونی بیرۆکەی عەلمانیەت لە خوارووی کوردستان دەگەڕێتەوە پێش دروستبونی پارتی دیموکراتی کورد لە ساڵی ١٩٤٦، زۆربەی سیاسەمەدارانی کورد ئەوسا (شیوعی) بون جا چ شیوعی ناو حزبی شۆڕش، ڕزگاری بووبن.

شیوعیەت، کە جۆرێکە لە سیکولاریزم، لە دوای دروستبونی پارتی بە ئاڕاستەیەکی دی داچو، چونکە بە شێکی زۆری شیوعیە کوردەکانی ناو حزبی (شۆڕش) و(ڕزگاری) بونە پارتی!!

ئەمەو وەنەبێ ئەو شیوعیانە دەست بەرداری مارکسیەت بوبن، بەڵکو ئەوانە لە بەر ڕۆشنای مارکسیەت، خەریکی کوردایەتی بوون. مارکسیەکانی ناو پارتی و حیزبی شیوعی عێراق نەیانتوانی بۆ ناو تاکەکانی نەتەوە شۆر بینەوە، بە واتای خەڵکی باشووری کوردستان تەواو لە سیکولاریزمی شیوعیەت نە گەیەنرا! بەلکو ئەو هەر دیزە بە دەرخۆنە کرا و بە ڕاشکاوی بۆ خەڵکی عەوام باس نە کرا!!

ناسیۆلیزمی کوردی بە بێ پرس کردن بە خەڵکی باشووری کوردستان، شیعری "ئەی ڕەقیب "، کە شیعری یەکی لە شاعیرانی

بزاڤی شیوعیەت بووە– کە چەندەها شیعری وەك رەخنە و گلەیی لە دەقی قورئان هەیە.لە هۆتێلێکی هەولێر مرد هەر شیوعی بوو، نەبووە پارتی !!لە باشووری کوردستان کێ رەقیب ی کوردە ؟؟ ئەوا دەسەڵاتی کوردی بە شێك لە دەسەلاتی بەغدا پێکدەهێنێت، بە جۆرێك سەرۆك کۆمار، جێگری دووەمی سەرۆك وەزیران، جێگری دووەمی سەرۆك پەرلەمان هەروەها چەند وەزیر و سەرۆك ئەرکانی سوپای عێراق کوردن!! کەواتە ئەوەی دوێنی دوژمنی کورد بوو، ئەمڕۆ بە ناچاری دۆستی کوردە لە دەسەڵاتدا! لە لایەکی تر شیعرەکە بۆ چیا نووسراوە، کەچی ئەمڕۆ ئێمە لە شارین و هیچ ئاماژەیەك بۆ تورکمان و کلدان و ئاشووری نییە ! لە هەمووی گرینگتر ناوهێنانی دەوڵەتی میدی و خەڵکی

میدیا بوو، هەروەها کورد هەر لە میدیاکانەوە وەپاش نەکەوتوون. کوردەکانی نێو ئۆرگانو دامەزراوەکان بزاڤی (شیوعیەت) و (مارکسیەت) هەتا دروست بوونی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی) لە ساڵی ١٩٧٠ نەیتوانیوە بەسەر مۆرکی دینداری کۆمەڵی کوردەواری زاڵ بن، هەر لەم ڕوانگەوە شیوعیەت لە کوردستان زیاتر مۆرکێکی سیاسی وەرگرتووە نەك ئایدۆلۆژی و فەلسەفی هەروەها کادیری شیوعی خاوەن ڕوئیایەکی دیار نەبوون، بە ئاشکرا

گوتــاری خۆیــان ئاراســتەی خــەڵکی عــەوام بکــەن ! خــەباتی شیوعیەکانی ئەوسا زیاتر خەریك بووە بە ململانێی چینایەتی نێوان (ئاغـا)و (کرمـانج) —ن. شـوعیەت خـۆی لـە خۆیـدا عەلمانیـەتێکی ئیلحادیە و پرسی ئیلحادیەکەش لەسەر چەند بنەمایـەکی مـەتریالی بینا کردووە، وەك دەڵێت: " لاإله والحیـاه مـاده"— هـیچ خودایـەك نییە و ژیان مادەیە، بەڵام زۆرێك لە شیوعی کلاسیکی کـوردی نـەك هەر مولحیـد نـەبوو نـە، بـەڵکو پـەیوەسـت بـە زۆرێـك لـە پایـەکانی ئیسلام و جیهانبینی ئیسلام بوونە.ئەو ئیزدیواجیەتە هۆکارێك بـوو بـۆ مردنــی شــیوعیەت وەك فەلــسەفەیەکی سیاســی یــان ئایدۆلۆژیایەکی سیاسی لە باشووری کوردستان. هەرچـەند پیـاوانی ئینگلیز ناو و ناتۆرەی "مـەلای سـور" یـان لـە مەلامستەفا دەنـا، بەڵام هەژموونی بارزانی لـەناو پـارتی دا هۆکارێـك بـوو بۆسـڕکردنی جموجۆڵی هزری و سیاسی مارکسیەکانی نـاو هـەناوی پـارتی. ئـەو دەسەڵاتەی بارزانی لە بڕیاری سیاسی پارتی دا، مەکتـەبی سیاسی پارتی— کە زۆربەی مارکسی بـوون— ناچارکرد گـەورەترین هەڵـەی سیاسـی و خیانـەتی نەتـەوەیی لەمێـژووی سیاسـی کـوردی تۆمـار بکـەن. لـە نـاو دەسـەڵاتی ڕژێمـی عێـراقیش لـە ڕێگـای گۆڤـاری (ڕزگــاری) و ڕۆژنامــەی (النــور) هــەر خــەریکی بڵاوکردنــەوەی

مارکسیەت و بزافی (ماوی) بوون. بەشێك لەو گروپە بەوەندە چالاکیە هزریە ڕازی نەبوون، بۆیە کۆمەڵەی مارکسی لینینی یان دامەزراند. ئەوانە وەك شیوعیەکانی ناو حیزبی شیوعی، شۆڕش، ڕزگاری و پارتی نەبوون خاوەن فەلسەفەیەکی ئیلحادی بوون باوەڕیان بە عەلمانیەتیەکی تەواو هەبوو، ئەوانە هەتا هەرەسی ١٩٧٥، بوونێکی ئەو تۆیان نەبوو هەروەها لەلایەن خەڵك و شۆڕشی کوردییەوە بە بەشێك لەمەکتەبی سیاسی پارتی: جەلالی دادەنران بۆیە هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و پارچە پارچە بوونی پارتی دەرفەتی زێڕینی بۆ خۆشکردن بۆ ئەوەی ئاراستەی سیاسی شۆڕشی کوردی بەئاقارێکی تردا ببەن. کۆمەڵەی مارکسی لینینی، لەساڵی ١٩٧٣- هوە لەڕیگای بڵاوکراوەی (ئاڵای سوور)ەوە ئایدۆلۆژیای سیاسی خۆیان بڵاو دەکردەوە. ئەوان لە ڕێگای جەلال تاڵەبانی یەوە تەبەننی ئایدۆلۆژیای سیاسی ماوتسی تۆنگ یان کرد. ئەندامە چالاکەکانی یان سەرکردەکانی، جگە لە تاڵەبانی باوەڕیان بە ئایدۆلۆژیای سیاسی هەردوو باڵی پارتی و هەردوو باڵی حیزبی شیوعی عێراقی نەبوو.

کۆمەڵە، هەر لە ناوەکەی دەردەکەوێ کە پەیڕەوی ئایدۆلۆژیایەکی توندی دەکرد تەواو لە سەر باوەڕی ئیلحادی

دەمەمڕزابوو. لەپاش هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و مانەوەی حیزبی شیوعی عێراقی لەناو بەرەی بەعس، دەرفەتێکی تر دروست بوو ئەو کۆمەڵەیە لەسەر هەرسیّ بنەماکەی حیزبەکەی ماوتسی تۆنگ: حیزبی پێشڕەو، حیزبی گەل، بەرەی نیشتیمانی، جاڕی شۆڕشی خۆیان بدەن: لەبارەی بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی چەپ و عەلمانیەتی ئیلحادی هیچ ڕێکخراوێکی عەلمانی کوردی بەقەد کۆمەڵەی نەکردووە. لەبەرئەوەی، ئەوانە لەمارکس، مارکسی تر بوون، لەتووندی لە (ستالین) و (لینین) توندتر بوون بەرامبەر دژەکانیان، بە تایبەتی سەرکردایەتی کاتی (قیادە موەقەتە)ی پارتی و شیوعی عێراق.

هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، ماڵوێرانی و نەهامەتی و پاشاگەردانی و دڵەڕوخانی لە کەسایەتی کوردی دروست کرد. دەلیلەیەکی ستراتیژی بۆئەوە دروستکرد، کە کۆمەڵە زەبری خۆی لە کەسایەتی مستەفا بارزانی و هەژموونی ئایینی لەناو شۆڕشی کوردی بدات!

بەحوکمی ئەوەی لە حەفتاکان بە بارزانی دەوترا مەلا مستەفا و هەروەها بە ڕاسپاردەی ئەو یەکێتی زانایانی ئیسلامی کوردستانی دروست ببوو، لە ئەزەر کۆمەڵەی، مارکس وتەنی: "دین

ئەفیونی- تریاکی گەلانە"، بۆیە هەر هۆکاری شکستی شۆڕشی ئەیلولیان نە دەدایە پاڵ، بەڵکو زۆر شتی تریش، کە هیچ بنەمایەکیان نەبوو. جارێ خۆی مەلا مستەفا مەلایەتی نەکردووە، بەڵام لە بنەماڵەیەکی ئاینی یاخود مەزهەب نەقشەبەندی پێگەیشتبوو. ئەویان بە هۆکارێك دادەنا بۆئەوەی ڕەخنە هەتا لە ترانسیۆنی دین بگرن. لەهەشتاکان، مارکسیەکی برادەرم، کە تەواو بەبێ ئاگا کەوتوو بووە ژێر کاریگەری برا گەورەکەی، دەیگوت: کە پاش ئەوەی بارزانی (دە)ساڵ لە سۆڤیەت مابۆوە، لینین بە دزی دەچێتە سەردانی، دەبینێ بارزانی خەریکی قورئان خوێندنەوەیە، لینین پێی دەڵێ: ئەوە دە ساڵە لە سەنتەری شیوعیەت دەژی هێشتا قورئان دەخوێنیتەوە؟!

ئەوەی شارەزای مێژووی چوونی بارزانی بۆ سۆڤیەت و ژیاننامەی سەرانی سۆڤیەت نەبێ، مەسەلەکە ئەوەندە گرنگ نابینێ و مەسەلەکە بە راست دەزانێت، وادەزانێ بە راستی لینین قەبوڵی ئەو ڕەوشەی نەکردووە! ئەو، ئەو تەلقینەی بۆیە فێرکرا بوو، کە ڕەخنەی توند لە بارزانی و ئاینی ئیسلام بگرێ! وەك هەردووك هاووتای یەکترن!!

بارزانی خۆی لە ١٩٤٧/٦/١٨ لە ئاوی ئاراس پەڕیوەوە و (لینین) لە ساڵی ١٩٢٤مردووە!! لە ساڵی ١٩٥٧ نەك لینین بەڵکو (جۆزێف ستالین)یش لە ژیاندا نەمابوو، چونکە جۆزێف ستالین لە ساڵی ١٩٥٣مردووە!!

عەلمانیەتی کۆمەڵە سەرەتایەکی لە ڕەوتی عەلمانیەتی مارکسی – ئیلحادی لە کوردستان درووست کرد، کە بە هیچ جۆرێ بەراورد ناکرێ بەو عەلمانیەتەی شیوعیەکانی کوردستان کاریان لەسەر دەکرد. سیکۆلاریزم لەناو بزاڤی مارکسیەتدا هۆکارێك بووە. چەندەها ئینشیقاقی سیاسی. هەر لە خودی کۆمەڵەی مارکسی – لینینی لەژێر کاریگەری مارکسیەتی ماویی دوو جار تووشی جیابوونەوەی سیاسی بووە. جاری یەکەم، فازلی مەلا محموود یەکێ لە سێ دامەزرێنەرەکەی کۆمەڵە– دووەکەی تر شەهابی شێخ نووری و فەرەیدوون عبدالقادر بوون– و فوئاد قەرەداغی لەسەر پەسەند کردنی "عێراقچێتی" لەسەرکردایەتی دەرکران. لە هەشتاکانیش جارێکی تر مەسەلەی "عێراقچێتی" و کوردستان چێتی، کۆمەڵەی مارکسی–لینینی بۆ دووباڵی نەوشێروان و مەلابەختیار دابەشکرد!!

فورسـان " هـه‌موو چـه‌کدار بـوون، لـه پـاش ئه‌وانـه ده‌وری ڕۆڵـی حیزبه‌کانیان دی!! ئه‌و حیزبانـه بـه هـه‌موو ره‌وتێکـه‌وه لـه ئێـران بـوون، چـونکه جـارێکی تـر دووچـاری ئاشبه‌تالی وه‌کـو شۆڕشـی ئه‌یلول ببوون ! ئه‌مجاره خۆیان له جیاتی تـاك حیزبـی، چـه‌ند-حیزبی بوون ! لـه جیاتی ئـه‌وه‌ی لابـه‌لا ئیـسلام ده‌وری هـه‌بێ لـه ئاراسـته کردنـی سـه‌رکردایه‌تی شـۆڕش، زۆربـه‌ی سـه‌رکردایه‌تی حیزبه‌کان مارکسی بوون !

# سێکشنی سێیەم

## قۆناغبەندی پێشنیازی ئایدۆلۆژی و پێشنیازی سیاسی

## خوێندنەوەیەك بۆ هاوپەیمانی حیزبی مارکسی و ئیسلامی

# زیندووکردنه‌وه‌ی مارکسیه‌تی نویٚ

ئایدۆلۆژیا له کۆمه‌ڵگه‌ی ڕۆژهه‌ڵاتیدا بارگه‌واویه به تیٚزی سیاسی. ئه‌گه‌ر ئایدۆلۆژیا هاوتای تیٚزی سیاسی نه‌بیٚت، ئه‌وه ئایدۆلۆژیا له منداڵدانی خۆی پیٚکۆڵ بۆ ته‌رزی سیاسی ده‌کات.

ئه‌م نووسینه به‌و عه‌قڵه داڕیٚژراوه، که بیٚ لایه‌نانه له هاوپه‌یمانی حیزبیٚکی مۆدرنی پاشخان و ڕابردوو مارکسی توندڕه‌و له‌گه‌ڵ حیزبی ئیسلامیدا. ئه‌و هاوپه‌یمانییه به پیٚوه‌ری ئیسلامی دروست و ساخله‌مه؟ یان به پیٚوه‌ری مارکسی دروسته ؟

بۆ ئه‌و دوو پرسیاره، وه‌ڵامیٚکی ساده ئاماده ده‌که‌ین، بۆ ئه‌وه‌ی خویٚنه‌ری ساده، له‌و مه‌سه‌له‌یه حاڵی بیٚ.

پیٚشنیازی ئایدۆلۆژی و قۆناغی ڕزگاری نیشتیمانی

له قۆناغی ڕزگاری نیشتیمانیدا حیزبی کوردی پیٚشنیازی جۆراو جۆر ده‌کات، ئه‌و گریمانیه تیۆریه مه‌رج نییه له ئه‌مری واقیعیدا هه‌موو بیٚنه‌دی. ئه‌و پیٚشنیازانه له‌و قۆناغه‌دا جۆره شه‌رعیه‌تیٚك په‌یدا ده‌که‌ن، به‌ڵام له دام و ده‌زگای ده‌وڵه‌تدا، پیاده‌کردنی ئه‌و گریمانه تیۆریانه ده‌وڵه‌تیٚکی سه‌ر کتیٚب، نه‌ك نیٚو واقیع، دروست ده‌که‌ن.

حیزبی مارکسی کوردی خەون بەوە دەبینێت، قسەکانی نێو مانفێستی شیوعی، تێڕوانینی ماتریالیزمی دایەلێکتی، سەرمایە، ئصولی فەلسەفەی مارکسی....پیادە بکات. گوێ بەوە نادات، کە خودی شیوعیەت لە سۆڤیەت و ئەورووپای شەرقی لە بەڕێوەبردنی وڵات هەرەسی هێنا هەروەها حسێب بۆ ئەوە ناکات کە شیوعیەت و دەوڵەتی دەرهاوێشتەی ناسیۆنالیزم بە بەهاری ئیسلامی کۆتایی پێهات.

حیزبی ئیسلامی تەواو دەرك بە مافی خودا لە سەر بەندە ناکات، ئەفسووس هێندە خۆی دەکووشی بۆ ئەوەی هاوتەریب بێ لەگەڵ هەژموونی جەماوەردا، کەچی لە بنەڕەتدا ئەو بیرکردنەوەیە لە دەرەوەی پرانسیپەکانی قورئانە.لە قورئانا ئەوەندەی سنوورەکانی خودا بەزاندن گرینگن نەبەزێندرێن، دەسەلاتی مەعنەوی جەماوەر هێندە گرینگ نییە. ئەوەتە پێغەمبەری ئیسلام دەفەرموێت: " لە ڕۆژی دوایی پێغەمبەر دێت تەنیا یەك کەسی لەگەڵە." لە نێو جەماوەر تەنیا یەك باوەڕی بە پەیامەکەی هێناوە.ئیمامی عەلیش لە نەهج بەلاغە دەڵێت: " ئێوە ئەی جەماوەر لە ستەم و نادادگەری دەسەلاتی سیاسی وڵات دەترسێن، بەلام من لە زۆر و بۆر و درۆی جەماوەر دەترسێم." ئێمە هەموو باوەڕمان بەوەیە، کە زمانی

کومڕاکەر دامەزراو لە سەر زانیاری میدیایی دووره یان بەدەرە لە گوتاری ئیسلامی.

حیزبی ئیسلامی وەک تەسلیمبوونێک بە هەژموونی جەماوەر لە سەر زەینی، لە دوا هەڵبژاردنی هەرێمی کوردستان، دوو حیزبی پاشخان مارکسی هێنایە نێو پەرلەمان، کەچی بە هەموو حیزبی چەپڕەوی کوردی تەنیا یەک کورسیان پێهات.ئەو بیرکردنەوە سەقەتە، حیزبی ئیسلامی ناچارکرد هەڵەیەکە گۆڕین دووبارە بکاتەوە، کەچی لڤین لە ژمارەی (٢٢٥)ی ١-٣-٢٠١٣ سیناریۆیەکی لایەنی بەرانبەر ئاشکرا دەکات، کە دەیەوێ:

یەکەم: حکومەتی ئایندەی کوردی عەلمانی بێت

لە ڕاپۆرتەکەی گۆڕان هاتووە: " حکومەتی داهاتوو زۆر گرنگە عەلمانی بێت، بۆ ئەوەی ئەو هەورە تاریکییە ئیسلامییەی بە سەر کوردستاندا باڵیکێشاوە بڕەوێنێتەوە و بەرنامەکانی خوێندن لە خورافە پاکبکاتەوە و هەژموونی مەلاکان کەمبکاتەوە – ل ١٠ لڤین."

دووەم: گەڕانەوە بۆ حیزبی دایک

گۆڕان لە ڕووی ئایدۆلۆژیەوە لە یەکێتی نزیکە، نەک حیزبی ئیسلامی. ئەو بەرەیە خەونی لە مێژینەی کە پێکەوە حکومەت

ئه‌وه‌ی هه‌یه: پێشنیازی سیاسیه

شـه‌ڕی گـۆڕان لـه‌و هه‌رایـه‌، دامه‌زرانـدنی حکومـه‌تێکی چـه‌پی عه‌لمانیه.لـه‌و ململانێیـه‌ی له‌گـه‌ڵ پـارتی هه‌یـه‌تی بـۆ "ده‌رهێنـانی ده‌سه‌ڵات و حکومه‌ته له ژێر چنگی پارتیدا."

له‌و هاوکێشه‌یه‌، بـۆ ئیـسلامی تێوه‌بگلێـت؟؟ ئـه‌وجاره حیزبـی ئیـسلامی لـه‌و ئۆپۆزسـیۆنبوونه ناتـه‌با و ناکۆکـه چـی ده‌ڵێـت ؟؟ زه‌ره‌ری حیزبی یان گره‌وکردن لـه سـه‌ر سنووربه‌زاندنی قورئـان ؟ ته‌فسیری ئاسان له ته‌فسیری نیوه‌ی ئایـه‌تی (٧)سوڕه‌تی (بـه‌راء-ته‌وبه)ده‌ڵێت: "هه‌تا ئه‌وان پابه‌ند و ڕاست و دروست بـن لـه سـه‌ر په‌یمانه‌که‌یان به‌رامبـه‌ر ئێـوه‌وه‌، ئـه‌وه ئێـوه‌ش پابه‌نـد و ڕاسـت و ڕه‌وان بن بۆیان، چونکه به ڕاستی خوا پارێزکارانی خۆشده‌وێت." که به‌رانبه‌ر پابه‌ندی ئۆپۆزسیۆنبوون له‌گه‌ڵ ئیسلامی نه‌بێت، نازانم ئیسلامی به چ پێوه‌رێك پابه‌ند و ڕاست ده‌بێ له‌گه‌ڵ حیزبـی چه‌پی عه‌لمانی ؟؟

ئه‌زموونی سیکیولاریزمی حیزبی کوردی له‌شاخ، مێژوویێك نی یه‌ که‌س شانازی پێوه‌ بکات، چونکه‌ ئه‌و ئه‌زموونه‌ دوور بووه‌ له‌ هه‌موو بنه‌ماکانی خودی سیکیولاریزمه‌وه_ عه‌قلانیه‌ت —نا—ئایینی، یه‌کتر قه‌بوولکردن، یه‌کترخوێندنه‌وه‌، حیزبایه‌تی مۆدێرن وه‌ك خۆیان بانگه‌شه‌ی بۆ ده‌که‌ن. کاتێ نه‌وه‌ی نوێ ڕه‌وشی سیاسی له‌ کتێبه‌کانی نه‌وشێروان مسته‌فا، مه‌لا به‌ختیار، ئه‌بو شوان، فاتیح ڕه‌سول، حه‌مه‌ی حاجی مه‌حمود، سامی عبدالرحمان...هتد ده‌خوێنێته‌وه‌، هه‌ست به‌ هۆڤانیه‌تێکی چاخه‌کانی ناوه‌ڕاستی ئه‌وروپا ده‌کات!! ئه‌و که‌لتوره‌ دوور له‌هه‌موو به‌ها ئینسانیه‌کان له‌ دوای ڕاپه‌ڕینه‌وه‌ بۆ ناو شاری کوردیش گواسترایه‌وه‌ و ئه‌زموونی هه‌ڵبژاردن و په‌رله‌مان و حکومه‌تی کوردی خرانه‌ ناو بازنه‌ی گومانه‌وه‌! به‌ (ڕا)ی من ئه‌گه‌ر بڕیاری (٩٨٦)ی نه‌ته‌وه‌ یه‌ککرتووه‌کان، که‌ ناسراوه‌ به‌ "نه‌وت به‌ خۆراك" نه‌بوایه‌ حیزبی کوردی ، نه‌ك هه‌ر هه‌ڕه‌شه‌یان له‌ ئه‌زموونی حکومڕانی مه‌ده‌نی کوردی ده‌کرد، به‌ڵکو جارێکی تر ئه‌و به‌شه‌ی کوردستانیان بۆچه‌ند ئیماره‌تێکی عه‌شیره‌تی دابه‌ش ده‌کرد!!

ئه‌و بڕیاره‌ی un خه‌ڵکی له‌ به‌شێك له‌ نه‌هامه‌تیه‌کان ڕزگار کرد.له‌ هه‌مووش گرنگتر به‌شێکی ئه‌و بودجه‌یه‌ له‌ڕێگای هه‌ندێ

گه‌نده‌ڵی ناو (un)ه‌وه كه‌وته‌ ده‌ستی هه‌ردوو حیزبی ده‌سه‌ڵاتدار، ئه‌مه‌ش بووه‌ هۆكارێ هه‌ندێ له‌سه‌رانی ده‌سه‌ڵاتی كوردی و به‌رژه‌وه‌ندی هاوبه‌ش كۆیان بكاته‌وه‌ و چی تر سه‌ر لوتكه‌كان له‌یه‌كتری نه‌گرن هه‌روه‌ها ئیداره‌ی جۆرج بۆش هۆكارێكی تر بوو، شه‌ڕی ناو خۆ دووباره‌ نه‌بێته‌وه‌ ! ! له‌پاش بێ ده‌نگكردنی تفه‌نگه‌كان، ئاراسته‌ی ئه‌و قه‌ڵه‌مانه‌ی كه‌ له‌ شه‌ڕی ئایدۆلۆژیا دۆڕاندبوویان به‌ناوی مۆدێرنیته‌وه‌ شه‌ڕێكی تریان له‌ناو كۆمه‌ڵگای كوردییه‌وه‌ به‌رپاكرد. ئه‌و شه‌ڕه‌، شه‌ڕی مه‌علوماتی و زانیاری مۆدێرنیته‌ نییه‌، به‌ڵكو شه‌ڕێكه‌ له‌گه‌ڵ كه‌لتوری كوردی و ئاینی كورده‌وه‌ ده‌كرێ.

زۆرجار وا ڕێك ده‌كه‌وێ كه‌ تفه‌نگه‌كان بێده‌نگ ده‌بن و خه‌ڵك بژێوی باش ده‌بێ و جۆرێك له‌ خۆشگوزه‌رانی به‌رپا ده‌بێ، هۆكارێك ده‌دۆزرێته‌وه‌ بۆقسه‌كردن له‌سه‌ر هه‌ندێ ڕه‌وش و هێماو كه‌لتوری میلله‌ته‌وه‌. به‌شێك له‌ نوسه‌رانی سیكوله‌ری كوردی، كه‌ زۆربه‌یان ئاستی ڕۆشنبیریان له‌مه‌ڕ ئایین – وه‌ زۆر لاوازه‌ به‌جۆرێ نه‌ك له‌ هه‌ندێ ده‌قی قورئانی ناگه‌ن، به‌ڵكو ناشزانن بیخوێننه‌وه‌. ئه‌و كاره‌ی ئه‌وان كه‌ ده‌یكه‌ن خوێندنه‌وه‌ی خۆیان نییه‌ بۆ چه‌مكه‌ ئایینیه‌كان، به‌ڵكو ئه‌وه‌ی هه‌ندێ عه‌لمانی عه‌ره‌ب و فارس له‌

ڕۆژهەلاتناس و نوسەرانی ڕۆژئاوایان وەرگرتووە، بۆ کوردی وەردەگێڕێ و بەناوی خۆیانەوە وەك خوێندنەوەی عەقلی کوردی بلاوده‌کەنەوە. ئەو ڕەوتەی سیکولاریزمی کورد دەیەوێ لە دیدگای ناصر ئەبوزێد، علی حەرب، محمد ئەرگۆن و محمد جابری و هەتا هاشم صالحەوە لە کەلتوری کوردی و قورئان بدوێ!! بەواتای هەتا ئێستا عەلمانیەتێك لە کوردستان درووست نەبووە کە دەرهاویشتە و زادەی بیرکردنەوە و تێڕوانینی کوردی بێ، هەروەك لە (حیزبکاری) و (مارکسیەت)دا، کورد چاوی لە عەرەب و تورك کردەوە! لەمەسەلەی عەلمانیەتی مەدەنیش، ڕۆشنبیری دەرەوەی بازنەی دین خەریکە چاو لەو بزاڤە دەستکردەی عەرەب و فارسەکان دەکاتەوە. هەرئەمەش وایکردووە لە سەردەمی ئێستادا بیرمەندێکی کورد لە بواری سیاسەت و مەسەلە جڤاکییەکان درووست نەبێ؟!

## + ئەو پرسانەی رۆشنبیرانانی سیکیولەر قسەی لە سەر دەکەن

جاریّ بەر لە هەموو شتێك رۆشنبیرانی نێو دەسەلات لە رووی هزرەوە کەمتر ئازادترن لە رۆشنبیرانی سیکولەری دەرەوەی حیزبەوە ! ئەو پرسانەی ئەوان دەیوروژێنن زیاتر لەوەی هزری بێت، حیزبییە. بەلام ئەوانەی دەرەوەی هەردوو حیزبی دەسەلات، بە تایبەتی سیکولەرەکان، ئەو پرسانەی ئەوان دەیوروژێنن، دەکریّ لەم خالانە کورتیبکەینەوە:

## یەکەم: جیاوازی ئایینەکان

ئایینەکان هەموو لە ڕووی پەرستنەوە یەك خودا دەپەرستن، بە واتای باوەڕیان بە یەکخودایی هەیە، بەلام لە هەندیّ سروتەوە لە یەك جیاوازن ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمەکە. دەکریّ مرۆڤ لە خودا یاخی ببیّ و بیرۆکەیەکی دی هەلبژێریّ بە تایبەتی نا-ئایینی وەك مارکسیەت، دیموکراسیەت یان لیبرالیزم.هەرچەندە لە تەڕەف خودا و پێغەمبەرەکەی بە چەندەها دەقی قورئان و فەرموودە ڕێز لە مرۆڤ گیراوە و ئازادیشکراوە لەوەی ﷺ جۆرە بیرۆکەیەکی

سیاسی و فەلسەفی هەڵدەبژێرێ.لە ڕوانگەی ئیسلامەوە مرۆڤ ئازادکراوە، کە هەر حیزبێکی یان گروپێکی سیکیولەر هەڵبژێرێ. ئەوەی گومان دروست دەکات خودی هەڵبژاردنی ئایینێکی ئاسمانییە، چونکە ئیسلام هێندە فراوانە وەڵامی هەموو پرسیارەکانی بە دروستی لایە. ئیسلام خۆی ئایینێکی ئاسمانییە لە سەر بنەما و شەنگستی دیتن و غەیب دامەزراوە. بونەوەر کە هەبوویێکی بینراوە. ئەوەی لە هەندێ دەقی قورئانەوە دەربارەی گەردوون، ئەوەی لە گەردوون هەیە، کۆرپەلەزانی و قۆناغەکانی و ئەوەی لە مرۆڤدا هەیە، بە واتای لایەنی توێکارزانی مرۆڤ، هەموو ئەندامەکانی وەك چاو، سوری خوێن، شێوەی پێکهاتەی سەر، شێوەی پێکهاتەی دڵ....لە گەڵ زانستی نوێ هاوئاهەنگیەکی گەورەیان هەیە، کە لە گەڵ ئایینە ئاسمانەکانی دی کە لە لایەن خودای قورئانەوە دابەزیون، بەڵام زاتی خودای گەورە بەڵێنی مەعصومبوونی نە داون و پارێزراو نیین و لە بەر ئەوەی دەستی مرۆڤی تێکەوتووە وەك ئینجیل، کە هیچی دەربارەی میراتی تێدا نییە هەروەك گوتمان دوو سەد زانای ئینجیلی لەو باوەڕەدان، کە تەنیا لە سەدا شانزەی ئینجیل کەلامی خودایە. لە هەموو ئایینێکی ئاسمانی مەسەلەی غەیبوون ڕووبەڕێکی گەورە داگیردەکات. هیچ

ئایینێك بێ غەیببوون–نادیاربوون لە مرۆڤ– و بێ هەبوونی زاتی خودا نییە.

ئەو سیکیولەرانە کێشەیان لە گەڵ هەبوونی زاتی خودایە، جا ئیسلام گۆڕین بە ئایینیکی دی پرۆسەیەکی نا ماقوولە، چونکە لە قورئان و فەرموودەدا باسی هەموو پێغەمبەرەکان کراوە. بۆ نموونە ئەوەندەی باسی مەسیح–عیسا پێغەمبەر لە قورئان کراوە بە ناو مێندە ناوی موحەممەد پێغەمبەر نە هاتووە !! بۆیە ئەوانەی دینگۆڕین دەکەن لە زاتی خوداوە هەڵدێن بەرەو باوەشی زاتی خودا دەچن، چونکە وەك لە پێشەوە باسمانکرد هیچ ئایینێك نییە، بەدەربێ لە هەبوونی خودا بێت و بێ نوێژ و ڕۆژوو بێت. ئەوان چاك دەزانن، کە خۆیان دەزانن ئەو نوێژانە لە تەرەف خوداوە قەبووڵ نییە هەروەها پێگیری بەو ئەرکانە ناکەن کە لە تەرەف ئەو خوداوەیەوە بە سەریان سەپاوە !!

نووسەر باوەڕی وایە، کە جگە لە خودای ناو قورئان و بونەوەرو خودی مرۆڤ لە ناو هیچ ئایینێك خودا بوونی نییە، چونکە خودا هەردەم خودایە. خودای ناو تەورات و ئینجیلی جوولەکان، جوولەکەو مەسیحیەکان ئاوایان دارژتۆتەوە خودایەتیان لە خودایەتی ڕامالیوە، خودایەتی و پەروەردەرگاری تەنها بۆ

جووله‌که ده‌کات !! ئه‌و خودایه قه‌بوولّی غه‌یری جووله‌که ناکات. له لایه‌ك پێغه‌مبه‌ره‌کان ته‌نها بۆ جووله‌که هاتوون و جیهانیی نین! له لایه‌کی تر، ئه‌و خودایه‌ی ئه‌وێنده‌رێ ده‌مارگیری له نێوان جووله‌که و غه‌یره–جووله‌که ده‌کات، بۆیه کورد وه‌ك نه‌ته‌وه له ناو ئه‌و ئایینه جێی نابێته‌وه!! ئه‌و کوردانه‌ی له ئیسلام هه‌لگه‌راینه‌وه له کلیسای کوردی جێیان له ناو ئه‌و کلێسایه نابێته‌وه، چونکه ئه‌و ئایینه تایبه‌ت به کورد نییه!! ئه‌وانه وه‌ك له نووسینێك باسمان کردووه ده‌کرێ له که‌لتوری کوردی پێیان بلّێین: " دین جاش"، چونکه جاشه‌یه‌تی ئایینی بۆ دینێك ده‌که‌ن، که له لایه‌ك دینی ئه‌وان نییه و له لایه‌کی تر مه‌سیحیه‌کان منه‌تیان به حوزوری ئه‌وان نییه له ناو ئایینه‌دا !! ئه‌و خودایه‌ی ناو ئاڤێستا و مه‌سحه‌فا ڕه‌ش‌و جیلوه و سه‌ره‌نجام زاتی خودای گه‌وره نییه، جا هه‌ر ناوێکیان لێده‌نێن ئازادن!!

## دووه‌م: مافی مرۆڤ

له قسه و باسه‌کانی ئه‌وانه‌ی ده‌ره‌وه‌ی ئیسلام پێیانخۆشه هه‌ر جه‌خت له سه‌ر مافی مرۆڤ بکه‌نه‌وه. به هیچ جۆرێك له قسه و وتاره‌کانیان باسی مافی خودا ناکه‌ن.وه ده‌یانه‌وێ ئه‌وه به خه‌لّك ڕابگه‌یه‌نن، که مافی مرۆڤ شتێکی نوێیه و له قورئان دانییه ؟؟؟

مەغزای گوتارەکانیان ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە ! ! دەبێ ئاوابێ لە قورئان باسی ماف مرۆڤ نە کراوە؟ لە وەڵامدا هەر ئەوەندە دەڵێین، کە لە قورئاندا هەیە: ئەوەندەی جەخت لە سەر خودی مرۆڤ –بەنی ئادەم کراوە، ئەوەندە جەخت لە سەر ئایدیۆلۆژیای مرۆڤ نە کراوە: زاتی خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: " مرۆڤمان بە باشترین شێوە ئافراندووە یان دروستکردووە " هەروەها دەفەرموێ: " ڕێزمان لە مرۆڤ ناوە " لە چەندین ئایەتی قورئان خودا بە " یا ایها الناس_خەڵکینە–گەلۆ " دەست پێدەکات، نەك موسلمانینە؟! خودا ماف دایەلۆك و قسەی هەتا بە ئەهریمەن داوە، جا چۆن بە مرۆڤی نادات ؟؟ ئەمە هەر قسەی کەسانی سیکیولەرە !

خودا کە شایەنی پەرستنە لە لای زۆربەی خەڵکەکانی خۆیان، کەچی بۆ نیشاندنی ڕێزیش بێ باسی ماف خودا لە سەر مرۆڤ ناکەن؟؟ ئەوان لە سەرچاوەی پڕ گومان باسی خودا دەکەن؟؟ ئایا زاتی خودای تاك لەو ژێدەرانە دەدۆزینەوە؟؟ لەو ژێدەرانە باسی دوالیزمی وەك " خودای ڕۆناکی " و " خودای تاریکی " لە ئاڤێستا" و سێینەی باوەڕ: باوك و کوڕ وگیانی پیرۆز لە چوار ئینجیلەکەی مرۆڤ کراوە ! ئەوان لەو سەرچاوانە دەیانەوێ خودا بدۆزنەوە، نایدۆزنەوە، چونکە زاتی خودای پاك و بێگەرد دوور و

سیٚ نییه، که‌واته کام خودا ده‌دۆزنه‌وه؟؟؟ خودای قورئانیان ناوی، ئه‌وه‌ی له ئاڤێستا و ته‌ورات و ئینجیل و مه‌سحه‌فا ڕه‌ش و جیلوه......زاتی خودا نییه، "هێزێکی شاره‌وه"، "و "میتافیزیك" و "ئه‌ودیوی سروشت "-ه!!! کیٚ ده‌لیٚ ئه‌هریمه‌ن نییه له شێوازێکی نوێدا؟؟

له مافی مرۆڤدا، زۆر باسی مافی ئافره‌ت ده‌کرێت ؟؟ باسی میراتی ئیسلامی ده‌کرێت؟ ئافره‌ت له ئیسلامدا زۆر ڕێزی لێگیراوه، که دایکه دایکی کوڕ و کچه، که کچه خوشکی کوڕ و کچه، له ماڵیش خاتوونی ماڵه‌وه. ئه‌رکی له ئیسلامدا، وه‌ك واجب که‌مه !! هه‌تا بۆی نییه لانکیش بۆ منداڵی خۆی ڕابژه‌نێت، بۆیه سیکیوله‌ره‌کان به هیچ جۆرێك باسی ئه‌رکه‌کانی ئافره‌ت ناکه‌ن، هه‌ر زمانیان بۆته ته‌قیو له مافی ئافره‌ت، هه‌ر بۆ ئه‌وه‌ی ئافره‌ت ئه‌و ڕێزه‌ی لێبینراوه، په‌ڕپوت کرێت! هه‌رچی مه‌سه‌له‌ی میراته وبه‌شی ئافره‌تانه زۆر قسه‌ی له سه‌ر ده‌کرێت!! ئه‌وان هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی ده‌زانن، که به‌شی ئافره‌تان نیوه‌ی پیاوانه!!! هه‌روه‌ك له زۆر بابه‌ت ئه‌وان له زاتی خودا رازی نین! ئه‌وان هه‌ر ئه‌وه ده‌وروژێنن که ئافره‌ت نیوه‌ی میرات له دایك و باوکی وه‌رده‌گرێت! ئه‌وه له ڕواڵه‌تدا سته‌مه، خودای قورئانی پیرۆزیش له چه‌ند ده‌قێکدا ده‌فه‌رموێت، که

سته‌می له سه‌ر خۆی حه‌رامکردووه..مه‌سه‌له‌ی به‌شه میراتی ئافره‌تان ئه‌وه‌مان پێده‌ڵێ که سیکیوله‌ری کوردی هیچ له سیسته‌می ئابووری ئیسلامی نازانن!!چونکه ئه‌و سیسته‌مه، سیسته‌مێکی سته‌مکاری نییه!! ئه‌و نیوه‌یه‌ی ئافره‌تان حاڵه‌تێکه، نه‌ك دیارده‌یه‌ك!مه‌سه‌له‌که په‌یوه‌ندی به جێنده‌ره‌وه نییه، حاله‌ت هه‌یه ئافره‌ت زیاتر وه‌رده‌گرێت! پیاو له کۆمه‌ڵگای ئیسلامه‌وه ده‌بێ پاره بدات به ژنه‌وه، هه‌رچی کچه له‌و مه‌سه‌له‌دا پاره وه‌رده‌گرێت!جا کێ نیوه وه‌رده‌گرێت؟؟!!بۆیه ئه‌وه‌ی شاره‌زا نه‌بێت له سیسته‌می ئابووری ئیسلام، ته‌واو له میراتی ئیسلامی ناگات، که به ڕاستی سیسته‌مێکی بێوێنه‌یه له په‌یوه‌ندی ئاسمان و زه‌وی.له لایه‌کی تر، ئافره‌ت له سه‌ری نییه مشوری گوزه‌ران بخوات، چونکه ئه‌و مه‌سه‌له‌یه له سه‌ر پیاوه! له سه‌ریه‌تی مشوری خۆشگوزه‌رانی پێویستیه‌کانی ئافره‌ت له ئه‌ستۆی بگرێت! له هه‌ندێ سیسته‌می میراتی ئه‌وروپیدا ئافره‌ت وه‌ك پیاو وه‌رده‌گرێت، به‌ڵام له سه‌ریه‌تی وه‌ك پیاو کار بکات !مشوری گوزه‌رانی ماڵه‌وه له ئه‌ستۆی پیاو و ئافره‌ته‌، چونکه هه‌ردووکیان هاوبه‌ش و به‌شدارن، نه‌ك ته‌نیا پیاو، له گوزه‌رانی خێزانه‌وه! به واتای باجی

ئەو وەك يەكيە بە كردەوە دەدات، بە جۆرێك ئەوەتە بۆتە جينسی سێیەم لە ئەوروپا!!!!!

مەسەلەيەكيدی هەتا بەشێك لە ئيسلاميەكان بە ترس و شەرمەوە باسی دەكەن، ئەويش مەسەلەی چەندژنيە! ئەوەتە كاتی خۆی لە هەشتاكان حوسێن عارف لە ڕۆمانی شاردا باسی كەسێك دەكات و دەڵێت: " قەوماندی " !! ڕەخنەگرێك دەربارەی ئەو قسەيەی نووسەر دەنووسێ: بە هيچ جۆرێك مەسەلەی هێنانی ژنی دووەم لە كۆمەڵگای كوردی، مەسەلەيەك نييە " قەوماندنی " بە كاربێنين. پرۆسەی چەندژنی لە مێژووی دەسەڵاتی ئيسلاميدا مەسەلەيەك نەبووە، خەڵك لێی بكۆڵنەوە و ببێتە كێشەيەك!! ناوی "كێشەی ئافرەت ".

من خۆم لە گەورەترين فەقيهی ئيسلامم لە تەمەن و زانستی شەرعی پرسی: ئايا چ پێويستە پياو بيكات بۆ ئەوەی ژنێكی تر بێنێت؟؟ لە وەڵامدا وتی: " جارێ وەك ئەركی شەرعی لە سەرت نييە بە ژنی يەكەم بڵێی ئاخۆ ڕازييە يان نە! هەروەها پياو لە ڕووی سەرمايە و جينسەوە لە خۆی ڕاببينێت، دەتوانێت ژنێكی تر بێنێت! پێويست بەوە ناكات دادگا ڕازی بێت يان نە."

یان ئەو ئاین و ئۆینەی هەندێ کەسانی ناو حیزبی ئیسلامی بانگەشەی بۆ دەکەن بەوەی دەبێ ژنی یەکەم نەخۆشی درێژخایەن هەبێ، یان نوقسان بێت..... !ئایا ئەو وەلامە ئەوە ناگەیەنێ، کە ئەو کەسانە کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەوروپای نا-دینی و سیکیولەرەکانی هەرێمی کوردستان، ئەگەرنا عائیشەی دایکمان نە نەخۆشی درێژخایەنی هەبوو وە نە نوقسان بوو! ! لە هەمووشی گرینگتر خودای گەورە جگە لە سورەتی النسا لە دنیا ئێمە و لە چەندین ئایەتی قورئاندا مژدە دەداتە پیاوانی باوەڕدار کە لەو جیهاندا چەند حۆریتان بۆ هەیە. دەترسێم هەندێ ئیسلامی ناو حیزبەکان و سیکیولەرەکان بەو پاداشتەی خودا ڕازی نەبن! !
مەسەلەی چەندژنی زۆر هەڵدەگرێ، بەڵام ئەم کتێبە تایبەت نییە بەو مەسەلەیەوە.

لایەکی دی ئەو مافەی بە ژن دراوە لە هیچ ئایینێکی دنیایی و ئاسمانی بە ژن نە دراوە: هەموو ئەو کەسانەی حەج دەکەن پێ لە شوێن پێی هاجەرەی هاوسەری ئیبراهیم پێغەمبەر دابنێن! ! !
هەروەها زاتی خودا ژنی ئەوەندە گەورە کردووە، بە جۆرێك پێغەمبەرێکی وەك زەکەریا پێغەمبەر هەندەی مەریەمی نە زانیوە و

هه‌ر له‌ ئه‌زموونی ئه‌و، دوعا و نزای له‌ خوا کردووه‌ منداڵێکی بداتێ!

## سێیه‌م: موعجیزه‌ نه‌بوونی قورئان

ناکرێ وه‌ك هه‌ندێ مه‌لا وه‌ڵامی قسه‌که‌ره‌که‌ره‌که‌ به‌ قسه‌یه‌کی کورت بده‌ینه‌وه‌ و بڵێین: ئه‌وه‌ی ئه‌و قسانه‌ ده‌کات کافره‌!!!!" ئه‌وه‌ی ئه‌و قسانه‌ ده‌کات هیچ په‌یوه‌ندی به‌ قورئان نه‌ماوه‌. ئه‌حمه‌د قه‌به‌نچی خۆی به‌ موفه‌کیری ئیسلامی مۆدێرن ده‌ناسێنێ، به‌ڵام ده‌رباره‌ی هه‌ندێ سوره‌تی قورئان ده‌ڵێت: نه‌هج البلاغه‌ی به‌ ناو هی علی بن أبی تالیب موعجیزه‌ی ڕه‌وانبێژی له‌ قورئان زیاتر تێدایه‌!!" هه‌روه‌ها له‌ به‌رنامه‌ی " به‌ بوێری " ده‌ڵێت: ئه‌وه‌ی له‌ قورئان بۆ پێغه‌مبه‌ر دابه‌زیوه‌، ته‌نیا بۆ سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ره‌، نه‌ك ئه‌مڕۆکه‌!! " جارێ ئه‌و موعجیزه‌ ڕه‌وانبێژیه‌ی له‌ قورئان دایه‌ به‌ هیچ جۆرێ به‌وه‌ی نهج البلاغه‌ به‌راورد ناکرێ! قورئان که‌لامی ئه‌به‌دی خودای گه‌وره‌یه‌ هه‌رچی نهج البلاغه‌یه‌ ئێستاش ساغنه‌بۆته‌وه‌ به‌ ڕاستی هی کێیه‌؟؟ ئه‌وه‌ زیاتر دیتنێکی مه‌زهه‌بیه‌ بۆ قورئان و ئیمام عه‌لییه‌! که‌واته‌ ئه‌و موعجیزه‌ی له‌ قورئان دایه‌ به‌راورد ناکرێ به‌ هیچ ده‌قێکی مرۆڤکرده‌، نه‌ك هه‌ر نهج البلاغه‌.

ئەو قسانە کۆنانەی قەبەنچی هەندەی مەزهەبین هێندە قسەی پێش قەبەنچی ین: ئەوەتە هەر کتێبێك لە لایەن سیکیولەرەکان نووسراوە بە ناوی " قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆیەتی ".
ئەو کتێبە بە نووسینی کتێبێك وەڵامدرایەتەوە و جەخت لە سەر ئەوە کراوەتەوە کە قورئان ڕەنگدانەوەی سەردەمی دابەزینی نییە، بەلکو هی هەموو سەردەمەکانە. ڕەصافی شاعیر کتێبێکی لە پاش مردنی لە ئەلمانیا بلاوکراتەوە. لە دەسپێکدا لە ساڵی ١٩٣٣ نووسراوە، کەچی لە بیبلۆگرافیاکەدا سەرچاوەی تێدایە هی ساڵی ١٩٣٦ یان ساڵی ١٩٦٦ —ن ! ئەمەش بەلگەیەکی ڕەوایە، کە گومان لە نووسینی ئەو کتێبە لە لایەن ڕەصافی بکەینەوە !! ئاخر چۆن شەك لە نووسینی کتێبەی بە ناو ڕەصافی نەکەین !! ئەو خۆی لە ساڵی ١٩٤٥ مردووە کەچی کتێبەکە سەرچاوەی هی ساڵی ١٩٦٦ تێدایە !!! ئەو کتێبە نەك هەر جێگای گومان لێکردنە، بەلکو دەستی کەسانی سیکیولەر غەیرە—ڕەصافی ی تێدا بەرچاوە !

سیکیولەرێکی کورد، کە بە داخەوە پێشتر ئیسلامی بووە، هەستاوە بە کوردی قسەکانی ڕەصافی دووبارە کردۆتەوە وەك بلێی ئەوەی ڕەصافی نووسیویەتی دەربارەی قورئان و پێغەمبەر بەشێك

لە ڕۆژهەڵاتنناسەکان نەیانووسیوە!! هیچ شتێکی نوێ لە کتێبەکەی ڕەصاف و کتێبی سیکیولەرە کوردەکەدا نییە، بەلکو کتێبەکانی ڕۆژهەڵاتنناسەکان و تەبشیریەکان و هەندێ سایتی عەرەب و فارسەکانی دژ بە قورئانە!!

کەسێ کە باوەڕ بە موعجیزەی ڕەوانبێژی و زانستی قورئانی پیرۆز نەکات، وەك قورئان دەربارەیان دەفەرموێ: "گوێ کەڕ و زمان لاڵ و مێشك بە کار نەهێن" هەزاران نموونە لە خودی خۆیان بۆ بهێنیەوە، باوەڕ ناهێنن بە خودا و قورئانەکەی.

ئەو دوو کتێبە دەیانەوێت هەموو سیفەتی پێغەمبەرایەتی لە پێغەمبەر موحەممەد ڕامالن، سیفەتی گەورەترین عەبقەری و ریفۆرمخوازی بدەنە پال!! ئەو ناسخ و مەنسوخەی ئەوان باسی دەکەن، بە تایبەتی کوردەکەیان بە درێژی لە کتێبەکی د. زەڵمی، بۆ نموونە، ڕەتکراوەتەوە!! وێڕای ئەوەش هەرچەندە نووسەرە کوردەکە وەختی خۆی ئیسلامی بووە، بەلام بە هەق لە دەسەلاتی زاتی خودا نەگەیشتووە، ئەگەرنا هەر خودایە بە چاو ترۆکانێك بتوانێت زەوی و ئاسمانەکان خاپور بکات، کە ئەمە بە نوێترین تەکنۆلۆژیای ڕۆژئاوا ناکرێت... ئەوان تازە بە تازە باسی ناسخ و مەنسوخ دەکەن!!!

## چوارەم: قورئان و ئەفسانە

کێشەی سەرەکی ئەوانەی لە دەرەوەی جیهانبینی ئیسلامن و لە سەر قورئان دەنووسن: یان ئیسلام بە ژمارەیەك لە ژمارەکان دەبینن یان ئەوەی لە قورئان ئاماژەی پێکراوە لە گەڵ ئەوەی لە تەوراتی جوولەکە، نەك تەوراتی حەقیقی خودا ئاماژەی پێکراوە بەراورد دەکەن!! ئەمەیان لە ڕووی توێژینەوەی زانستی لە جێی خۆی نییە، چونکە لە رووی توێژینەوەی سینکرۆنیدا- بە شێوازی ئێستایاندا-قورئان هەر ئاسمانییە هەرچی ئەو تەوراتەی جوولەکەیە، کە بە پەیمانی کۆن لێرە و ئەوێ قسەی لە سەر دەکرێ، سیفەتی ئاسمانیی لە دەست داوە!!

کاتی خۆی قورەیشیەکان-ئەوانەی تەسلیم نە بوون بەوەی لە قورئان هاتووە-وەك قورئان خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە، بە قورئانیان دەگووت: " ئەفسانەی پێشووەکان "ئەوان ئاوایان دەگووت، نەك پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ئیسلامیان پێ ڕاست نەبێت. یان پێغەمبەریان پێ شتێکی سەیر بێ لە دەرەوەی سنووری ئاوەزی ئەوان بێت!! هەندێ لەوانە پێیان خۆش بوو پێغەمبەر لە بەنی هاشم نەبێت، ئەگەرنا کەسێکی وەك ئەبی

حه‌که‌م (که ئه‌بو جه‌هلی لای ئیسلامیه‌کان ناسراوه) ده‌یزانی ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ر ده‌فه‌رموێ دروسته و له خۆی نییه! ئه‌م سه‌رگوزشته‌یه بۆ ئه‌وه‌یه، که بڵێم قوره‌یشیه‌کانی ئه‌وسا که زۆربه‌ی زۆری نه‌خوێنده‌وار بوون، به‌ڵام له‌وانه‌ی ئێستا به تایبه‌تی سیکیوله‌ره‌کان زیاتر ده‌رکیان به راستی کرد بوو! له گه‌ڵ نه زانی‌و که‌م زانستی خۆیان زیاتر ده‌رکیان به هه‌قیقه‌تی بوونی زاتی خودا له بونه‌وه‌ر کرد بوو! ئه‌و زانسته‌ی ده‌رباره‌ی " ئه‌ندازه‌ی جینات له قورئاندا " هه‌یه، هه‌موو سنووری به‌زاندنی ئه‌فسانه ده‌به‌زێنێت ! هه‌ر زوو ئه‌وه تێده‌گات که ئه‌و قورئانه دانراوی که‌سێکی نه‌خوێنده‌واری وه‌ك پێغه‌مبه‌ر نییه، به‌لکو ئه‌وه‌ی له قورئان هاتووه که‌لامی خودایه و دووره له‌وه‌ی ئه‌فسانه‌ی ئه‌وانه‌ی پێش ئێمه بێت...

ئێمه هه‌ر ئه‌وه‌نده ده‌رباره‌ی قورئان و ئه‌فسانه ده‌دوێین، که بابه‌ته‌که داوا بکات. زاتی خودا له لایه‌ن هه‌موو موسلمانێکه‌وه پیرۆزه. نووسه‌رێکی کوردی هه‌ڵگه‌ڕاوه له ئیسلام له ڕۆژنامه‌یه‌کی پڕ له گومان ده‌نووسێت: " ئاین و فه‌لسه‌فه یه‌کانه‌یان به خودا به‌خشی، گه‌ردونیان کرده نا پیرۆز و خودایان کرده پیرۆز...." ئاین، به تایبه‌تی ئیسلام، ئه‌قڵ به مرۆڤ ده‌به‌خشی له‌و

پرۆسەیەش شەڕی ئەفسانە دەکات. زاتی خودا خۆی یەکانەی لە زەینی مرۆڤ دروست دەکات هەر خۆی بونەوەری ئافراندووە و هەر خۆیشی پیرۆزە تاکو ئایین و فەلسەفە پیرۆزی بکەن! لە شوێنێکی تر دەنووسێت: " ئاینەکانیش مرۆڤ بەرەو خودایەکی لە مرۆڤ چوو دەبەنەوە بۆ ئەوەیە تا مرۆڤ ئاسودە بێ و توانای بێت بحەوێتەوە" ئەو لە سەردەمی ئیسلامەتیش بۆ ئەوەی لە رووی دەروونی بحەوێتەوە گۆرێکی بۆ خۆی لێدا بوو! ئەگەرنا، وەك خودا خۆی دەفەرموێ: "هیچ کەسێ وەکو ئەو نییە " ئایینێکی وەکو ئیسلام زاتی خودا بەرەو مرۆڤ نابەتەوە تاکو مرۆڤ ئاسودە بێ و لە توانای بێ بحەوێتەوە ! ! ! !

هەر بۆ گومان دروستکردن لە سەر ژیاننامەی پێغەمبەرەوە، نوسەرێکی هەڵگەڕەوەیتر لە ئیسلام ڕەخنەی ئەوە لە کەلتور و مێژووی ئیسلامی دەگرێ ئەوەی دەربارەی لەشکری ئەبرەهە و خودی ئەبرەهە نووسراوە و بە ساڵی فیلەکە ناسراوە، لە هەمان کاتدا رۆژی لە دایکبوونی پێغەمبەرە و ئەو روداوە لە ساڵی ٥٧٠ یان ٥٧١ بووە.نووسەر هەندێ ئەفسانەی سەیر و سەمەرە دەهێنێت دەڵێ ئەبرەهە لەو ساڵە هێرشی نە کردۆتە سەر مەککە و کابە ! ! هەندی شتی سەیری سەنحاریبی ئاشووری دەهێنێت و

دەنووسێ: "ئەم چیرۆکە سەیر و سەمەرەی هیرۆدۆت دەیگێڕێتەوە ڕەنگە سەرچاوەیەکی چیرۆکە یەهودیەکە بێت دەربارەی تێکشانی سینحاریب بێت هەروەها لە گەل چیرۆکە قورئانیەکەدا لێکچونی هەیە لەو روەوە کە لە هەردوو چیرۆکەکەدا گیاندارێکی لاواز وەکو یارمەتییەکی خوایی رۆڵ دەبینێت." بەر لە هەموو شتێك چیرۆکە قورئانیەکە وەکو چیرۆکە یەهودیەکە نییە لە روداو و گرێچنە و کاراکتەرەکان ! هەر خۆی دەڵێ ئەوەی هیرۆدۆت دەیگێڕێتەوە سەیر و سەمەرەیە!! هەروەها دەنووسێ: "ڕەنگە........"کە لە ڕووی ماناوە بە مانای "لەوانەیە " دێت کە واتای گومانکردن دەبەخشێ!! جارێ کە باوەڕ بەوەی ڕویداوە لە ساڵی ٥٧٠ چۆن باوەڕ بە چیرۆکێك دەکەی کە لە پێش زایین ڕویدابێ؟؟؟ هەبوونی یان حازربوونی زاتی خودا لە هەر چیرۆکێك و ئەفسانەیەك ئاساییە، چونکە زاتی خودا لە زەینی موسلمانێك و ئەفسانەپەرستێك هەیە! کە دەڵێی: " لە هەردو چیرۆکەکە گیاندارێکی لاواز وەکو یارمەتییەکی خوایی ڕۆڵ دەبینێت " لە سەردەمی سەنحاریبی ئاشووری هیچ ئایینێکی ئاسمانیی باسنەکراوە چۆن ئەوەندە لە توێژینەوەی زانستی بە دووری!! ئەو چیرۆکەی لە قورئاندا هاتووە ئامۆژگاری و پەند بووە بۆ ئێمە و گەلەکە، چۆن لە چیرۆکەکەدا

گیاندارێکی لاواز وەکو یارمەتیی خوایی ڕۆڵ دەبینێت؟؟ کەی ئەمە لە زاتی خودا دەوەشێتەوە؟چۆن قورئان چیرۆکێکی ئەوها لە خۆ دەگرێ؟؟

چۆن موحەمەدێکی نە خوێندەوار ئاگای لە چیرۆکێك هەیە کە پێش لە زایین ڕوویدابێت ؟؟؟

بە ڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانەوێ قورئان بەو چاوەی ئەوان شتەکان ببینێ، لە قسەی قوڕەیشەکان تێناپەڕێت ! ئەوەی ئەوان دەربارەی قورئان و خودا دەیڵێن ئەفسانەیەکە تەنیا لە ئەقڵ و زەینی نەخۆشی ئەواندا بوونی هەیە !

قسەی ئەوانە لە ژێدەری ئەهریمەنی چەنراو دەچێت، ناسیۆنالیستی کوردی دەیەوێ مێژوویێك لە سەر ئەفسانە بنیات بنێت، بۆ نموونە ڕوداوی نەورۆز، کە لە بنەڕەتدا بۆ زیندووکردنەوەی ناسیۆنالیزمی فارسی داڕێژراوە، کورد لە هاوکێشەکەدا ونە هەروەها لە هاوکێشەی دی، دەبێ کورد شیوەن بگێڕێ، چونکە لەو ڕۆژەدا پاشایەکی کورد لە لایەن فارسەوە کوردەتای لە سەرکرا. ڕای ئەو برادەرانە ڕێك وەك ناسیۆنالیستی سیکیولەری کوردە، مێژوویێك لە سەر بنیاتی ئەفسانەیەکی ساختە دادەڕێژێت.

# نه‌وروز له نێوان ئه‌فسانه و مێژوو و ئاییندا

ئه‌وه‌ی فیرده‌وسی له که‌لتور و مێژووی فارسدا باسی هه‌بوونی ئه‌فسانه‌یه‌ك ده‌كات به ناوی ئه‌فسانه‌ی " نه‌ورۆز له نێوان كاوه‌ی ئاسنگه‌ر و زوحاك " ، به ڕاستی ئه‌فسانه‌یه‌كه له زه‌هنی كه‌سێكی هۆشمه‌ند جێگیر نابێت. ئه‌و ئه‌فسانه‌یه، كه له سه‌رده‌می ناسیۆنالیستی كوردی یان له سه‌رده‌می ده‌سه‌ڵاتی كوردی یاد ده‌كرێته‌وه و به پیرۆز ده‌زاندرێت. ئه‌و ئه‌فسانه‌یه چه‌ند مه‌دلولێك ده‌رباره‌ی ڕه‌چه‌ڵه‌كی كورده‌وه له خۆ ده‌گرێ! یه‌كه‌م جار ئه‌فسانه‌كه وا داڕێژراوه‌ته‌وه زۆر بۆنی شۆڤینیه‌تی لێدێت.دووه‌م.به پێی گێرانه‌وه‌ی مه‌سعودی شیعه مه‌زهه‌ب بۆ ئه‌فسانه‌كه، كورد له ڕه‌چه‌ڵه‌كی ئه‌وانی ده‌ربازبووی نێو چیا و جنۆكه په‌یدا بوونه !! ئه‌مه‌ش له ڕای ئایین و مێژوویی مرۆڤایه‌تی دووره.

## مێژووی بێ به‌ڵگه‌ی نه‌ورۆز

ئاماژه‌یه‌ك له قورئانی پیرۆز و مێژووی كوتیه‌كان قسه له سه‌ر بوونی ئه‌فسانه‌ی نه‌ورۆز به شێوه‌یه‌كی ناراسته‌خۆ ده‌كرێت.ئه‌و قسه‌یه‌ی ده‌رباره‌ی نوح پێغه‌مبه‌ر و گه‌لی كوتی ده‌كرێت. به پێی

گێڕانه‌وه‌ی قورئان: "نوح له نزاکه‌ی داوا لـه خـودا ده‌کات، که لـه خـاکێکی پـیرۆز دایبـه‌زێنێت. ئـه‌وه بـوو لـه چـیای جـودی دایده‌به‌زێنێت. "لـه به‌رئـه‌وه‌ی چیای جودی و گـودی–گـوتی لـه ڕووی مۆرفۆلۆژیدا له یه‌کده‌چـن، ده‌وتـرێ نـوح لـه گـه‌ڵ گوتیـه‌کان بووه، هه‌تا سه‌رسام ده‌ڵێت کاوه گووتی بـووه !ئـه‌وه‌ی په‌یوه‌نـدی به نه‌ورۆزه‌وه هـه‌بێت، ده‌وتـرێ ئـه‌و ڕۆژه‌ی نـوح و باوه‌ڕداره‌کـانی ڕزگاریان بووه نه‌ورۆز بووه ! ئه‌و جۆره زه‌ن یـان گریمانـه لـه سـه‌ر ئه‌و شه‌نگسته دروسـت بـووه، کـه هه‌نـدێ بـه گوتییـه‌کان ده‌ڵـێن "گودی " تورکه‌کان زۆربه‌ی " د "ی کۆتایی ده‌که‌نـه " ت " وه‌ك: نـه‌وزاد ده‌که‌نـه نـه‌وزات یـان نـه‌وزه‌ت. هـه‌روه‌ها میـسرپه کـۆن و نوێیـه‌کان پـیتی " ج " ده‌که‌نـه "گ " بـه‌مجۆره جـودی ده‌بێتـه گودی یان گوتی ! ! به‌ڵام با له خۆمان بپرسـین: ئه‌گـه‌ر کـورد ئـه‌و سه‌رده‌مه‌ی پێش لافاوه‌که په‌یوه‌ندی به نـوح پێغه‌مبـه‌ره‌وه هـه‌بوو بێت، ئـه‌وا زۆر که‌للـه ڕه‌ق بووینـه. نـوح پێغه‌مبـه‌ر ٩٥٠ سـاڵ هـه‌ر خه‌ریکی بانگه‌وازیکردن بووه بۆ دینی خـودا !بـه‌ڵام وه‌ك هه‌نـدێك گریمان ده‌که‌ن، له‌وانه‌یه له پاش لافاوه‌که لـه یـه‌کێ لـه کوڕه‌کـانی نوح په‌یدا بوو بن، ئه‌وا ئه‌گه‌ر وا بێت ئه‌وا هـه‌موو کوردێك ده‌بێت بـاوه‌ڕی وا بێـت کـه بـاکووری کوردسـتان لانکـه‌ی مرۆڤایه‌تیـه و

مرۆڤایەتی قەرزداری کوردن، نەك عەرەبی موصل و نەجەف وەك هەندێ توێژەری عەرەبی پێشبینی دەکەن !!! ئەوە چیای جودی نە لە موصل و نەجەفە بەلکو لە باکووری کوردستانە !! بەلگەش لە سەر هەبوونی جودی لە باکووری کوردستان، بوونی ئێستاش شاری "شەرناخ "ە، کە خۆی لە بنەڕەتدا لە "شاری نوح " وەرگیراوە.

ڕایەکی دی کوردی هەیە، قورئان لە مەسەلەی پێغەمبەر ئیبراهیم و نەمرودی دکتاتۆر بە بێ ناوهێنان دووجاری جیاواز ئاماژە بە نەورۆز دەکرێت. جاری یەکەم کاتێك هەموو خەلك چوونە دەرەوە بۆ ئاهەنگگێران، تەنیا ئیبراهیم پێغەمبەر نەبێت. ئا لەو دەمەدا ئیبراهیم پێغەمبەر هەموو بتەکان دەشکێنێت.

لەو مەسەلەیدا بەبێناوهێنانی نەورۆز قسە لە سەر هەبوونی نەورۆز دەکرێت! لە دەقی قورئاندا ئاماژە بەوە دەکرێ، کە نەك هەر خەلکەکە بەلکو خودی باوکی ئیبراهیم پێغەمبەر بتپەرست بووە. جا ئەگەر نەورۆز کوردی بێت و ئیبراهیم کورد بێت، دەبێ قەبوڵی ئەوەش بکەین کە باوك و باپیرەی ئێمەی کورد ئەوسا بتپەرست بووینە.دووەم جار. لە بەرانبەر تووڕەیی نەمرود لە سەر ئەو کارەی ئیبراهیم پێغەمبەر دەهاوێژنە ناو ئاگر، زاتی خوداش لە

سه‌ر ئه‌و کاره بۆ ئیبراهیم به وه‌لامدێت و ده‌فه‌رموێ: " ئه‌ی ئاگر سارد و سه‌لامه‌ت– و بێ زه‌ڕ به بۆ ئیبراهیم "

کورد له‌و مه‌سه‌له‌یه خۆی به ئاری داده‌نێت و سروشت په‌رست بوونه، به‌لاّم له‌م چیرۆکه ئیلاهیه‌دا ده‌رده‌که‌وێت، قه‌ومی ئازه‌ر بتپه‌رست بوونه !

## مێژووی به‌لگه‌داری نه‌ورۆز

له‌و ماوه‌یه‌ی که ناسیۆنالیستی کوردی جه‌ختی له سه‌ر ده‌که‌ن، ده‌رکه‌وتنی ده‌وڵه‌تی ماده که ١٥٠ ساڵیی خایاندووه هه‌ر له ماوه‌یه‌ش کالێنده‌ری کوردی به ده‌رکه‌وتنی ماده‌وه په‌یوه‌ستکراوه ! له دیاکۆوه تاکو ئه‌ستیاگی خایاندووه، به‌لاّم له ساڵی ٥٥٠ پێش له دایکبوونی عیسا، به پیلانی کچه‌زای خۆی (کۆرشی گه‌وره) و ده‌ستوپێوه‌نده‌کانی کۆتایی به ده‌وڵه‌تی ماد هاتووه و ئه‌خمینیه‌کان ده‌وله‌تێکی فارسی دروست کردووه...

کێشه‌ی ململانێی کۆرشی گه‌وره و ئه‌ستیاگ، ڕووخانی ده‌وڵه‌تی ماد(که له ئه‌ده‌بیاتی کوردی به میدیا به ناویانگه) و دروستبوونی ده‌وڵه‌تی ئه‌خمینی به سه‌ره‌تای نه‌ورۆز دانراوه، که فیرده‌وسی زۆر

شانازی بەو سەرکەوتنەی فارس کردووە! ئەگەر ساڵنامەی کوردی لە ساڵی ٧٠٠ پێش میلاد دروست بوو بێت، ساڵی ٥٥٠ یان ٥٤٩ پێش میلاد دەوڵەتی میدیا ڕووخا بێت، ئەوا نەک نەورۆز بۆ کورد مەرگەساتە، چونکە لە نەورۆزدا دوا پاشای میدی کوژراوە! سرودی "ئەی ڕەقیب "یش دەکەوێتە ژێر گومانەوە! هەروەها وەک لە خوارەوە ئاماژەی پێدەکەین هەر لە کتێبەکانی موسلمانەکانی پێشوو ئاماژە بەوە دەکرێ کە ئاڵای فارسەکان "کەفشی کاویان" بووە!! جا کە کاوە فارس نە بوو بێت چۆن فارسەکان "کەوشی کاویان " دەکەنە ئاڵای خۆیان؟؟

نەورۆز خۆی لەخۆیدا ئەفسانەیەکی گەلانی ئاری نەژادە، نەک هیندۆئەوروپی! لەدوای سەرهەڵدانی کێشەی ئایینی ومەزهەبکاری لەپاشان ناسیۆنالیستی، نەورۆز چوارچێوەیەکی تری وەرگرت. سەبارەت بەکوردەوە، گرینگی دان بە ئەفسانەی نەورۆز، لە لای ناسیۆنالیستی کوردەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی بزافی نەتەوەیی و "سەرکەوتنێکی نەتەوەیی" لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا.

لەناو ئاری نەژاداندا، ئارێشەکە تەنیا لەنێوان کوردو فارس دایە، چونکە هەردوو کارەکتەری سەرەکی ئەفسانەکە گوزارشت لەودوو

نەتەوەیەدەکەن.هەر ئەو ململانێیەش تەم ومژی لەسەر ڕووداوەکە دروستکردووە.ئەمڕۆ ئاسان نیەکۆدەنگییەك لەسەر ئەو ڕوداوە دروست بێت، چونکە لەگۆڕەپانی کوردستان زیاترلەڕەوتێکی سیاسیی وئایدۆلۆژیای هەن! هەریەکەی ڕووداوەکە لەگۆشەنیگای ئایدۆلۆژی خۆی دەبینێ.

ئەگەر لەسەدەی نۆزدەوەمەوە، نەورۆز وەك سەرکەوتنێکی نەتەوەیی سەیرکراوە وکاوە کراوە بەکورد وزوحاك یان ئەژدیهاك کراوە بەفارس.دەکرێ لەم سەردەمەدا ڕووداوەکە بەجۆرێکی تربخوێندرێتەوە ئەوەتەئاسوورییەکانی کوردستان خۆیان بە"ئاشوری" دەخوێننەوە هەروەها یەکی نیسان دەکەن بەسەرەتای مێژووی ئاشوری.ئەومێژووەش زۆر پێش سەرهەڵدانی لەدایك بوونی مەسیح بووە! فارسەکانیش زۆر شتی بەرلەئیسلامبونیان پیرۆز رادەگرن.دەکرێ کوردیش بە جۆری تر بخوێننەوە:

١-بکرێ بەسەرەتای ساڵنامەی کوردی یان،
٢-بکرێ بەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی میدی،
٣.مردنی یەکێ لە سەرۆکەکانی کورد،
٤.ڕۆژی ڕزگارکردنی کەرکوك.

هەرچەندە وەك لە پێشەوە ڕوونمان کردۆتەوە زەرەری کورد لەو مەسەلەیە لەوە دایە، چونکە هەر بە تەنیا ماد نییە، بەلام مێژووی دروستبوونی دەولەتی، نەك رووخانی، لە قازانجی کورد دایە.ئەو بۆنانە لۆژیکێك لەخۆدەگرن، بەلام نەورۆز بەئەفسانەی کاوە وزوحاك بەستنەوە هیچ لۆژیکێك وناسنامەیەکی نەتەوەیش بەڕوداوەکە نابەخشێ.

کتێبە مێژووییەکانی ئیسلامی زۆربەیان باسی نەورۆزیان کردووە وەك ئەفسانەیەکی عەجەم – غەیرە عەرەب –باسیان لێوە کردووە هەتاهەندێکیان باسی ئاهەنگ گێران لەنەورۆزدا لەسەردەمی ئیمامی عەلی باس کردووە. مێژوونوسانی کوردیش وەك مەردۆخی، محمد ئەمین زەکی، سالح قەفتان، هەروەها نوسەری "امجاد الاکراد"یش باسیان لەنەورۆز کردووە. ئەوانی تر زیاتر لەسەر بنەمای عاتیفەی نەتەوەییەوە نوسراون. لەهەندێ کتێبدا (کاوە) بە"کوتی-کودی" دانراوە هەتا هەندێکیان کردوویانەتە پێغەمبەر. لەوپێودانگەوە ئەوەی گرینگە بزانرێ کە نەورۆز جگە لەئەفسانەیەك هیچی ترنییە، ناکرێ ڕۆژی نیشتیمانی نەتەوەیەك لە سەر ئەفسانەیەکی ساختە بنیات بنرێ، بەلام چ لە

ئەفسانەیاخود خۆرزگارکردن لەئەفسانە وبیناتنانی واقعێکی مەعریفی و لۆژیکی..

نەورۆز تەنیا هی نەتەوەی کورد نییە ئەمە بەڵگەنەویستە. بەڵام بەدیتنی من ئەگەر ئەفسانەی نەورۆز بەهەردوو کارەکتەری کاوەو ئەژدیهایەك ببەستینەوە، ئەوە بەهیچ جۆرێ کاوە کورد نەبووە. ئەم ڕایەشم پشت بەم بەڵگانە دەبەستێ:

١- کاوە گوتی"نیە"بەڵکو فارس بووە.لە "شەڕی قادسیە" فارسەکان "ئالای کاوە-کەفشی کاویان " یان کردبووە ئالای ئەمپراتوریەتی خۆیان! جائەگەر کاوە کورد بوویێ، دەبێ فارسەکان بەچ لۆژیکێك ئالای بکوژی پاشاکەیان بکەنە ئالای ئەمپراتوریەتەکەیان؟ ئەگەر بە پێچەوانە نەبێ: کاوە فارس، ئەژدیها کورد بێ..

٢- ئاستاگ یان ئاستیاگ دوا پادشای پاشاکانی میدیەکان بووە، فارسەکان لە سەر کاری دەوڵەتی میدیا لایانبردووەو دەوڵەتێکی فارسیان دروست کردووە!! بەمجۆرە ئەفسانەی کاوەیان دارشتوە.بە زیندانیکردنی ئاستیاگ کۆتایی بەدەسەلاتی کوردەکان هاتووە.ئەوە بە هۆی ناپاکی هارپاکی جێگری ئاستیاگ

دەسپێکی ساڵی کوردی دابنێین، ئەوا دەبێ باوەڕ بەوە بکەین کە مێژووی کۆنی کورد لە میدیەکانەوە دەست پێدەکات!!! بەمەش زۆر مێژووی کۆنی کورد لە دەست دەدەین!

زۆربەی بۆ چوونەکان لە سنورێکی تەسک، جودا دان. زۆربەی هەرە زۆری نوسەری کوردو دەسەڵاتی کوردی باوەریان وایە نەورۆز جەژنەیەکی سەداسەد کوردییەو کاوەکوردەو زوحاك فارسە.ئەوە هەر خاوەن ئەفسانەکە، فیردەوسی، دەڵێت زوحاك عەرەبە و کاوە فارسە!! لەو مەسەلەیدا وەك چاوەڕێ دەکرێ شاعیران بە قووڵی لە مەسەلەکە بڕوانن کەچی هەتا زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی و نوێ ی کورد شیعریان بۆ ئەو بۆنەیە وتووە، بە کوردیکردووە! ئەوا دەقی شیعری

ئەمرۆ رۆژی ساڵی تازەیە نەورۆز هاتەوە

جەژنی کۆنی کورد...

کە بوترێ کەس نییە چەند کۆپلەیەکی لێ نەزانێت.

لەم دەمەتەقێیەدا ئەوە ئاشکرا دەبێ، کە دەسەڵاتی مەعریفی و سیاسی کورد لە سەر هەندێ بەڵگەی زانستیەوە مێژووی خۆی بنووسێتەوە! دەیانەوێ بچنە ناو مێژووەوە یان لە دەرەوەی

مێژوو بن مەسەلەیەکە لە لایان وەك لوغزەکەی هاملێتی شەکسپیری لێهاتووە:

دەبێ یان نابێ

ئەوە پرسەکەیە!

## ئایینی کورد و قورئان

هەندێ سیکیولەری کورد زۆریان دەربارەی قورئان نووسیوە، بەڵام جگە لەوەی ئەوەی نووسیویانە کاوێژکردنەوەی سیکیولەرە عەرەب و فارسەکانە، بە تایبەتی ئەوفارسانە بە سیستەمی مەلا ئاخوندەکانی ئێران ڕازی نین! ئەوە هیچ ئەوەی ئەوان نووسیویانە ناچێتە خانەی توێژینەوە، چونکە توێژینەوە گرفت و ئامانج و گریمان و ئەنجامی خۆی هەیە. هەر چ نەبێ لەو گریمانانەی باسیکردوون، هەندێکی هێناوتە دی. لەو ناوەش شتێکی نوێی هێناوە، کە پێشتر کەسێك باسی نەکردوون!! ئەوەی ئەوان دەربارەی قورئان باسیان کردووە هیچ شتێکی نوێیان نەهێناوە و ناشیهێنن، چونکە ئەوانە لە ناو ڕابردوو دەژین. لەمەش زیاتر، قورئان لە سەر ئەو مەسەلانە دەدوێت، کە هەمووی لە زاتی خودا دەوەشێنەوە:

## یه‌که‌م: ژماره

خودا له‌ شتی ئه‌وها به‌ ژماره‌ ده‌دوێ و ئه‌و ژمارانه‌ وا باس ده‌کات له‌ خه‌یاڵی هیچ مرۆڤێکی هۆشمه‌ند دانییه‌: چۆن پیاوێکی نه‌خوێنه‌وار له‌ سه‌ده‌ی حه‌وته‌م قسه‌ی ئاوا بکات؟؟ بڵێت: ئه‌وه‌نده‌ جاره‌ له‌ قورئان باسی شته‌ دژه‌کان، پێچه‌وانه‌کان وه‌ك یه‌ك هاتووه‌، هه‌ر بۆ نموونه‌:

جیهان و کۆتایی هه‌ر یه‌که‌ی ١١٥ جار

ژن و پیاو هه‌ر یه‌که‌ی ٢٤جار

ژیان و مردن هه‌ر یه‌که‌ی١٤٥ جار

خه‌ڵکی عه‌وام که‌ به‌ الناس ناسراوه‌ و له‌ گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ران ٥٠ جار

سته‌م و ئارامگرتن هه‌ر یه‌که‌ی ١١٤ جار

محمد و شه‌ریعه‌ هه‌ر یه‌که‌ی ٤ جار

نوێژ ٥ جار

ڕۆژ ٣٦٥ جار

مانگ ١٢ جار

ڕێژه‌ی زه‌وی-وشکاتی + ڕێژه‌ی ده‌ریا _ئاو ١٠٠ جار !!!!

مرۆڤێکی نەخوێندەوار هەتا خوێندەوار لە سەدەی حەوتەمی میلادی چۆن ئەو هەمانگیەی نێوان شتە پێکچووەکاندا پێسازاوە؟؟ ئەو سیکیولەرانە لە دەرەوەی ڕووداوەکانی مێژوو دان، چونکە یەکێك نەهاتووە ڕەخنە لە شتێکی زانستی قورئان بگرێت!! دەبێ چاك بزانین قورئان کتێبێکی زانستی و تایبەت بە زانست نییە، چونکە خودی خاوەنەکەی، کە زاتی خودایە، ناکرێ لە تاقیگەدا وەك هەبووەوێکی فیزیکی، بایۆلۆژی یان کیمیایی شەن و کەو یان تاو توێ بکرێت! وێڕای ئەوەش زاتی خودا بە ئەقلی مرۆڤ نابینرێتەوە، چونکە ئەقڵی مرۆڤ دەستەوەستانە لە سەر خودی خودا هەروەها ئەقڵی مرۆڤ لە سەر دیارکردنی ناسنامەی شتەکان ڕای خۆی هەیە کە لە گەڵ سیستەم و شەریعەی خودا تێکناکەنەوە، هەر بۆ نموونە ئەقڵی مرۆڤ بڕیار دەدا لە سەر باشبوونی هاوسەرگیری نێر و نێر و مێ و مێ هەروەها لە سەر زینا–جووتبوونی ناشەرعی لە نەزەر ئیسلامەوە– و خواردنەوەی ئارەق!!!

وەك لە پێشەوە گوتمان بە شتی لار زاتێکی وەکو خودا بە تەنیا ئەقڵ و فیزیا و کیمیا و بایۆلۆژی ناتۆزینەوە!!! بەلکو توێژینەوە لە خودی خۆت و زەوی و دەریا هەروەها لە زاتی قورئان وەك

ده‌قێك ده‌گه‌یه‌ ئاستێك بۆت ده‌رده‌كه‌وێت، كه‌ هاوئاهه‌نگی و سیسته‌مه‌یه‌ی له‌ پێكهاته‌ی ئه‌و هه‌موو شتانه‌ دایه‌ به‌ ڕێكه‌وت و له‌ لایه‌ن سروشتی مه‌خلوق دروستنه‌كراوه‌!!!!جا ئه‌و هه‌موو ژماره‌ وه‌كیه‌كه‌ وا له‌ مرۆڤ نه‌كا، باوه‌ڕ به‌ بوونی خودا له‌ پێكهاته‌ی خۆی نه‌كات، ئه‌وا وه‌ك قورئان ده‌فه‌رمویٚ ئه‌و جۆره‌ كه‌سانه‌ له‌ ڕابردوو و ئێستادا " كه‌سانێكن لالٚ و كوێر و كه‌ڕن له‌ به‌رانبه‌ر دیتن‌و بیستنی ڕاستی هه‌روه‌ها مێشك پووچن".

## دووه‌م: ئه‌ندازه‌ی جیناتی مرۆڤ

ئه‌و قۆناغانه‌ی كۆرپه‌له‌ له‌ سكی دایكی پێیدا تێپه‌ڕ ده‌بێت، حاڵه‌تێكی زۆر سه‌یر و سه‌مه‌ره‌یه‌ هه‌تا بۆ زانستی نویٚ. ئه‌و مشت و مڕه‌یه‌ی ده‌رباره‌ی كۆرپه‌له‌ هه‌یه‌، هه‌تا له‌ قۆناغه‌ كۆتاییه‌كان نه‌بیٚ! نه‌وه‌ك زانینی زایه‌ندی زارۆكه‌كه‌ له‌ قۆناغه‌ به‌راییه‌كاندا.جا كه‌سێكی نه‌ خوێنه‌وار له‌ سه‌ده‌ی حه‌وته‌م چۆن قۆناغه‌كانی كۆرپه‌له‌ له‌ ناو سكی دایكی زانیووه‌؟؟ هه‌ر مه‌سه‌له‌ی ئه‌ندازه‌ی جیناتی مرۆڤ مه‌سه‌له‌یه‌كه‌ مرۆڤێكی شاره‌زای پزیشكی نه‌بێت، جوان له‌ مه‌سه‌سه‌له‌ی كرۆمۆسه‌كان تێناگات ! ئه‌و كرۆمۆسانه‌ هه‌ندیٚ سیفه‌تی بۆماوه‌یی و جه‌سته‌یی و ده‌روونی له‌ دایك و

باوکەوە دەگوازنەوە ! ! ئەرێ با خۆمان بپرسین ئایا زمان و نەتەوە کرۆمۆسین یان کۆمەڵایەتین؟؟ ئێمە لە سەدەی بیست و یەك ئەو جۆرە پرسیارانە لە خۆمان دەکەین، ئەدی محمدێك لە سەدەی حەوت چۆن توانیویەتی لە ئەندازەی کرۆمەسەکانی ناو پێکهاتەی خۆی وەکو مرۆڤ بگات؟؟ سەبارەت بە پرسیارەکەوە هەر هێندە دەڵێین جیاوازی زمان و نەتەوە هەردووك ئایەتی گەورەیی و هەبوونی زاتی خودان. جارێك جۆری زمان و نەتەوە: کێ کوردە و کێ عەرەبە، کێ تورکە............پەیوەندی بە کرۆمەسەکانەوە نییە، ئەگەرنا لە کۆمەڵگاوە، بە تایبەتی دایکی فێر دەبێت! ! بۆیە شتێك دروست دەبێت، کە پێی دەڵێن: زمانی دایك یان زاری دایك، کە لە زمانی زگماك جیاوازن.

## سێیەم : شەریعە

شەریعەی ئێمە لە گەڵ شەریعەی غەیری ئێمە جیاوازە. زۆر کەس پێی خۆشە کە ئیسلام وە لێبکرێ لە گەڵ سەردەم بگونجێ: لابردنی ئایەتی جیهاد، چەندژنی، وەکیەکی میراتی کوڕو کچ.... ئیسلام شەریعەی خۆی هەیە.ناکرێ وەك مەریوان وریا قانع دەڵێت ئیسلام بە دیموکراسی بکرێ ! ! کارل پۆپەر لە پرانسیپەکانی

کۆمه‌لگای کراوه‌دا ده‌نووسێت: ئه‌گه‌ر به پێشێلکردنی دیموکراسیش بێ نابێ لێبگه‌رێین مارکسیه‌کان _ کۆمه‌نیسته‌کان ده‌سه‌لات وه‌ربگرن، چونکه هه‌ر خۆیان خه‌ته‌رن له سه‌ر خودی دیموکراسیه‌وه". وه نه بێت دیموکراسی وه‌ك فۆکۆیامه له " کۆتایی مێژوودا " وا ده‌نووسێت که ئه‌قڵی مرۆڤ دوا شت گه‌یشت بێ پێی لیبرالیزمی ڕۆژئاواییه "، که‌چی هابرماس ده‌نووسێ: ئه‌گه‌ر مرۆڤ له سۆفیه‌ت له ژێر حوکمی مارکسیه‌تدا له سێداره ده‌درێت، ئه‌وا له رۆژئاواش له ژێر سایه‌ی دیموکراسیه‌تدا له سێداره ده‌درێت!!! ئه‌و هه‌موو قسه و نموونانه‌م بۆیه هێناوه‌ته‌وه چۆن مارکسیه‌ت و دیموکراسیه‌ت، هه‌رچه‌نده مرۆڤزاده‌ن، شه‌ریعه‌ی خۆیان هه‌یه، ئیسلامیش له گه‌ڵ ڕێژه‌ی ناو هاتنی محمد، شه‌ریعه‌ی بۆ محمد هاتووه وه‌ك یه‌که، که‌واته شه‌ریعه‌ی ئیسلام به قه‌د ئه‌و سه‌رده‌مه‌ش و هه‌تاهه‌تایێ بوونی هه‌یه.

شه‌ریعه‌ی ئیسلام، یاسای ئیسلام مه‌سه‌له‌یه‌که یان وه‌ك زانایه‌کی ئیسلامی ده‌ڵێت: " یان ده‌بێ هه‌مووی قه‌بووڵ بکرێ و په‌یره‌و بکرێ یان ده‌بێ وازی لێبهێنرێ " ئه‌وجا که وایه ده‌بێ وا بێ ئایه‌تی جیهاد –هه‌روه‌ك پێشمه‌رگه چه‌ند سه‌ده‌یه دژی حکومه‌ته‌کانی عێراقی خه‌باتی چه‌کداری کردووه و ئێستاش پ که

که خه‌باتی چه‌کداری دژی حکومه‌تی تورکی ده‌کات-وازی لیٚ بهیٚنریٚ ؟ چه‌ندژنی،، سیسته‌می کۆمه‌لاٚیه‌تی پاکتر ده‌کات، نه‌ك وه‌ك سیکیولاریزم ئیش ده‌کات له سه‌ر خاپوورکردنی بنه‌چه‌ی مرۆڤ، هه‌ندیٚ ئیٚستاشی له‌گه‌لٚ دابیٚ، نازانی باوکی کیٚیه ؟ سیکیولاریزمی کوردی ئه‌وه‌ی ده‌ویٚ، ئیٚ با به ئاشکرا به نه‌ته‌وه‌که‌ی بلیٚ نه‌ك له ژیٚر په‌رده قسان بکات!له‌وه‌ش زیاتر ئایه‌تی چه‌ندژنی، ئایه‌تیٚکی ئیلاهیه، وازی لیٚناهیٚنریٚ!با ئه‌وه‌ی له به‌نبه‌ر مرۆڤه‌کان هه‌لنٚه‌خه‌لتیٚین، له‌ویٚ مرۆڤ بۆته رۆبۆت و ئامیٚر، به جۆریٚك گیانی مرۆڤبوونیان له ده‌ستداوه ! ئه‌مه وه نه‌بیٚت له ژیٚر سایه و سیٚبه‌ری حوکمی ده‌سه‌لاٚتداران و دکتاتۆره‌کانی رۆژهه‌لاٚتی ناوه‌راست مرۆڤ هه‌ست به مرۆڤبوونی خۆی بکات!! له‌ویٚ حکومه‌ت له گه‌لٚ خه‌لٚك هاوبه‌شه-شه‌ریکه.مرۆڤ له به‌یانیه‌وه تاکو پیٚنجی ئیٚواره کار ده‌کات، که‌چی حکومه‌ت له باج -هه‌ر خۆی زه‌کاتی ئیسلامیه، به‌لاٚم له جیاتی مانگی ره‌مه‌زانیٚ، هه‌موو مانگیٚکه-و کاره‌با و ئاو و خزمه‌ته‌کانی تر... مرۆڤ ده‌کاته جسکی هه‌یاس و له گه‌لٚ تۆ ده‌بته برابه‌ش !!!هه‌تا ژن و منداڵه‌کانت ده‌بیٚت به خولیٚای حکومه‌ت بیٚت ! من باسی که‌لتور و دین و

سیاسەتی ڕۆژئاوا ناکەم، ئەگەرنا ستەمی دکتاتۆرەکانی ڕۆژهەڵات نەبێت، کەس بەرگەی ئەو ئامێریوونەی ڕۆژئاوا ناگرێت ؟!

وە نەبێ دەولەتانی ڕۆژئاوا لە گەڵ زمانی کوردان باش بێ، وەك سیکیولەری کورد پێمان دەفرۆشێ!

## ڕۆژئاوا و زمانی کوردی

کورد چەند سەدەیەکە ئاشنای ڕۆژئاوایە ! کۆنترین ئاشنابوون دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە میلاد، بە تایبەتی زەینەفۆن وسوپاکەی کە بە کوردستان تێپەڕین. ئێمە لەم نووسینەدا باسی پەیوەندی ڕۆژئاوا و کورد لە قۆناغە جیاوازەکان ناکەین، چونکە ئێمە مێژوویەکی پڕ لە شانازیمان لە گەڵ ڕۆژئاوا نییە، هەر بۆ نموونە تەنیا ئاماژە بە ڕێککەوتنامەی سایکس–بیکۆ و سازانۆف دەکەین، کە لە نیوەی جەنگی یەکەمی جیهانی بە دزی وڵاتی کوردانیان بە ڕەنگ و پیت بۆ خۆیان دیاریکرد بوو ! یەکێ لە ئاکامەکانی کۆدەتایی بەلشەفی، یاخود کۆمۆنیستەکان لە ئەدەبیاتی خۆیاندا پێیان خۆشە پێی بڵێین شۆرشی ئۆکتۆبەر، ئاشکراکردنی ڕێککەوتنامەکەی سایکس–بیکۆ بوو هەروەها کشادنەوەی سازانۆف بوو لەو ڕێککەوتنامەیە و ڕاگەیاندنی حکومەتی

بەلشەفیه!! هەرچەندە حکومەتی بەلشەفی، بە سەرۆکایەتی فلادمیر لینین کوردستانی سۆری لە دەفەرێکدا ڕاگەیاند، بەڵام هەر لە کاتی لینین بریاردرا کە کورد نەتەوەیەکی نیشتەجێی سۆڤیەت نییە، بۆیە دەبێ لە شوێنی باوك و باپیرانیان ڕابگوزەرێن !! پاش مردنی لینین لە ساڵی ١٩٢٤، جۆزێف ستالین "کوردستانی سۆر" هەڵوەشاندەوە!!! مرۆڤ هەندێ " چاکە "ی ڕۆژهەڵاتنناسەکان لە بیر نەکات. ئەوان نەبووانەیە بە تەنیا هەندێ توێژەر و شەهادەدەرانی کورد لێبکەرابوونایە، حسابی ئەدەب وکەلتور و مێژوومان لە شوێنێکی تر دەبوو! ! ڕۆژهەڵاتنناسی وەك ئەلێکزەندەر ژاپا بە یارمەتی و هاوکاری مەلا مەحمودی بایەزیدی و هەروەها هەوڵ و پێکۆڵی بازل نیکیتین، کە بە یارمەتی مەلا سەعیدی کوردستانی- ئەمە هەمان دکتۆر(پزیشك) سەعیدی کوردستانی (کۆنە فەقێی یەکێ لە مزگەوتەکانی سنەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان)، هەڵگەڕاوە لە دینی ئیسلام و بە مەسیحی بوو هەروەها پیلاندارێژەری شیعری سەر پێستەکە و گۆڕەری مێژووی نوێی کوردی نییە، بەرز دەنرخێنین، چونکە ئەوانە زۆر دەقی کوردیان لە فەوتان ڕزگار کردووە! ئەمە وانییە هەرچی ئەوان نووسیویانە، ئێمە پێی ڕازین! من هێندە باسی مێژووی کورد و ڕۆڵی باش و خراپی

ڕۆژئاوا ناکەم، ئەگەر دەتەوێ باشتر لە ڕۆڵی ئەورووپا و رووسیا لە مێژووی کورد تێبگەی کتێبی بەندە بە ناوی " دۆزی کورد لە نێوان بەرداشی مارکسیەت و دیموکراسیەت " بخوێنەوە، چاوەڕێ دەکرێ هەندێ زانیاریت دەربارەی مەسەلەکە بداتێ!!

دەمەوێ ئەوە بڵێم کە پیاوانی دەوڵەت لە ڕۆژئاوا هەر لە ڕووی سیاسیەوە غەدریان لە کورد نەکردووە: ئەدی هەر ئەوان بە جۆرێک پاڵپشتی داگیرکەرانی کوردستانی گەورەیان نەکردووە ؟؟.هەر ئەوان جگە لە ڕیککەوتنامەی سایکس–بیکۆ، ڕاستەوخۆ دەوریان لە سازدانی ڕێککەوتننامەی سان ریمۆ، لۆزان و.......شۆڕشی ئەیلول نە بووە بۆ ئەوە دانەرشتووە بۆ ئەوەی چارەنووسی کورد هەر ژێردەستەیی بێ؟؟. جگە لەوانەی کە ئاماژەمان پێکردووە، ئەدی کێ بوو حکومەتەکانی، کە بە هەڵە پێی دەگوترێ حکومەتی شێخ مەحمود، شێخ قادری برای شێخ مەحمود و ڕاپەرینەکانی بارزان و شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران و شۆڕشی ئاگری داغ.......لە ناو برد؟؟؟

من ئەوەندە باسی مێژوو ناکەم، ئەوەندەی ئاماژەیشم پێکردوون تەنیا بۆ ئەوەم بووە، کە نەوەی نوێ ئاگاداری ئەو

غەدرانە بێ کە ڕۆژئاوا لە دۆزی کورد و کوردی وەک نەتەوەیەک کردووە!!

ئێستا زۆر مامۆستا ئاوا باسی دەوڵەتانی ئەورووپا دەکەن: بەوەی زمانی کوردی لەو دەوڵەتانە ئازادە و لە قوتابخانەکاندا دەخوێندرێت!! با بزانین ئەوەی لەو قوتابخانەنە دەخوێندرێت بە ڕاستی زمانی کوردییە؟؟ نکۆڵی لەوە ناکرێ ئەوەی لەو دەوڵەتانە بەرانبەر زمانی کوردی دەکرێ بەراورد ناکرێ بە دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان و خودی دەسەڵاتی کوردی!! جارێ لەو دەوڵەتانە زمانی کوردی هەر سیستەمی پەروەردەیان قەدەغەیە هەرچی حکومەتی هەرێمیشە ئەوە سیستەمێکی پەروەردەیی زۆر سەیر پەیڕەو دەکات، بە کورتی یەک نەتەوەی وەک کورد دوو ستاندەر، کە پێی دەگوترێ "جووتستاندەر، لە پەروەردە بۆ داندراوە!! ئەمەش لە ناو هیچ نەتەوەیەک بوونی نییە!!! لە قوتابخانەکانی ئەورووپا، نەک یەک سیستەمی، یەک ستاندەریی پەیڕەو ناکرێ!! لەوێ زمانی دایک، لەوێ زاری دایک، زمانی حکومەتە بۆ منداڵی زۆڵ، کە بە داخەوە زۆرە، بۆ کورد بۆتە بەڵا!! بەڵێ لەوێ زاری سۆرانی، بادینی، کرمانجیی، هەورامیی، زازایی....دەخوێندرێ، بەڵام زمانی کوردی وەک زمانێکی ڕەسمی،

زمانی پەروەردە ناخوێندرێ! !ئەمەش جۆرێکە لە دابەشکردنی کورد یان داننەنانە بە حکومەتی کوردی.گرینگیدان بە زارەکانی زمانی کوردی، ئەوەی لێ دەخوێنرێتەوە، کە ڕۆژئاوا بە چاوی نەتەوە تەماشای کورد ناکەن، وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆ شایەنی دەوڵەتی خۆیەتی، بەلکو وەك چەند هۆز و عەشیرەتێك سەیری کورد دەکەن! !جا ئەوەی لە ئەوروپا دەکرێ ژیاندنەوەی زارەکانی کوردییە، نەك زمانی کوردی!

## سیکیولەری کورد چی لە قورئان دەوێت؟؟

لە بەر ئەوەی قورئان خۆی لە ڕووی زمانەوە بە زمانی عەرەبیە! عەرەبییەکەی قورئان چەند مەسەلەیەك لە خۆ دەگرێت: یەکەم.من لە چەندان نووسین ناوم لێناوە زمانی قورئان، چونکە لە زۆر ڕووەوە لە زمانی عەرەبی نەتەوەیی جیاوازە، یەکەم قورئان ئیلاهییە، هەرچی زمانی عەرەبیە وای لێهاتووە زمانی ئاخاوتنی هەر تاکێکی عەرەبیزان بێ

!دووەم خوێندەوار و نە خوێنەوار وعەرەب و غەیرە عەرەب وەکو کورد و فارس و تورك.....لێی دەگات بە ڕێژەی جیاواز هەرچی زمانی عەرەبیە تەنیا خوێنەواری عەرەب دەتوانێت لێی

بکات! دووەم قورئان تەنیا بۆ نەتەوەی عەرەب نییە بە واتای قورئان ئایینێکی نەتەوەیی نییە وەك ئایینە ئاسمانییەکانی پێشوو وەك ئایینی جوولەکە و ئایینی کوردی، بەلکو ئایینی هەر کەسێکە پێوەی پەیوەست بێ! جا لە چ نەتەوەیەك بێ، عەرەب یان غەیرە عەرەب، گرینگ نییە!

گوتاری قورئان بۆ موسلمانی پەیوەست یان پابەند بە یاسا و ڕێساکانی ئیسلام ئەوەیە، کە جگە لە ئیسلام هیچ ئایینێك جیهانی نییە، بەلکو هەموو جگە لە قورئان گوتاریان بۆ نەتەوەیەکی دیارکراوە. ئەوانەی جگە لە ئیسلام داوا دەکەن، وەك هەندێ سیکیولەری کورد بە هەر بیانوویێك بە ناو دەبنە مەسیحیی یان زەردەشتی کەچی ئەو دوو ئایینە بە چەند سەدەیەك لە ئیسلام کۆنترن؟؟!!

کەس نکۆڵی لە هەبوونی ئایینی کوردی ناکات، ئەمەش لە بەر ئەو هۆیانە:

١. چەندەها ئایەتی قورئان هەیە کە باسی ڕێزی خودا لە هەر مرۆڤێك دەکەن ، خاوەنی هەر ئایدۆلۆژیەك بێ، وەك " ئێمە ڕێزمان لە بەنی ئادەم ناوە ".٢.هەر پێغەمبەرێك پێش محمد پێغەمبەر

هات بێت له نه‌ته‌وه‌ی میلله‌ته‌که‌ی بووه.له‌مه‌ش زیاتر "په‌یامه‌که‌ی یان کتێبه‌که‌ی وه‌ك ته‌ورات و ئینجیل و ئاڤێستا...." به زمانی میلله‌ته‌که‌ی بووه به واتای په‌یامی پێغه‌مبه‌ری کورد به زمانی کوردی بووه.

٣.له مێژوودا ده‌قێك هه‌یه، جا ئه‌مه هه‌و بێت یان نه، ئه‌وه به پێی ده‌قی قورئان پێغه‌مبه‌ر و کتێبێکی کوردی هه‌بووه به زمانی کوردی بووه!!

٤. هه‌رچی ئاڤێستا و ئینجیله بۆ نه‌ته‌وه‌یه‌کی دیارکراو هاتوون.

ئه‌وه ئینجیل بۆ پێغه‌مبه‌ر و نه‌ته‌وه‌که‌ی دیاره: ئه‌ویش پێغه‌مبه‌ر عیسا و جووله‌که‌یه!! کورد له ناو ئینجیل وه‌ك نه‌ته‌وه‌یه‌کی جیاواز له جووله‌که و بڕوادار به‌و ئایینه جێی نابێته‌وه، چونکه ئه‌و ئایینه تایبه‌ته به نه‌ته‌وه‌ی جووله‌که و به هیچ جۆرێك جیهانی نییه تاکو کوردیش بگرێته خۆی!! هه‌رچی ئاڤێستایه هێشتا ساخنه‌بۆته‌وه، که کوردییه یان فارسیه!! جاری ئه‌و کتێبیه‌ی ئاڤێستا که هه‌یه ئاسمانی نییه! له پاش ئه‌وه‌ی ئه‌سکه‌نده‌ری مه‌کدۆنی ئه‌وه‌ی ئه‌مڕۆ پێی ده‌گوترێ ئێران داگیرکرد ئه‌و ئاڤێستایه‌ی هه‌بوو سوتاندی!! ئه‌و ئاڤێستایه‌ی

هەیە ئاسمانی نییە، بەلکو لە سەردەمی ساسانییەکان نووسراوە، بە فارسی کراوە!!!! ئەگەر چەند وشەیەك لە ئاڤێستا بە زمانی کوردی بچێت ئەو پرۆسەیە ئاساییە لە ناو زمانە ئاریەکان و هیندۆ-ئەوروپاییەکان یان سەدان وشەی ئاڤێستا بە زمانی فارسی کۆن و نویٚ دەچێت!! ئایا ئەو پێکچوونانە لە ڕووی زانستی زمانەوە ئاوامان لێدەکەن بڕیاری ئەوە بدەین، کە ئاڤێستا بە زمانی فارسییە!!!!

هەرچی ئیسلامە ئەوا ئاینی کوردە ! لەوانەیە یەکێك بپرسیٚ چۆن و لە سەر چ بنەما و شەنگستێك ئیسلام ئاینێکی میللەتی کوردە ؟؟ زۆر کەس دەنووسن ٪ ٩٥ لە کوردەکان موسلمانن، من نالێم لە سەدا ٩٥٪ی کورد موسلمانن، بەلام من دەلێم خۆ لە سەدا ٩٠٪ی کورد موسلمانن!!نەتەوەیەك لە سەدا نۆوەدی موسلمان بێت چۆن خۆی بە بەشێك لەو ئاینە نەزانێت یان ئاینەکە بە هی خۆی نازانێت؟؟ کورد لە زۆریەی عەرەب ئاسانتر موسلمان بووە! ئەوە هەندیٚ لە سەدا ٢٪ یی کورد پێکنایەتن خۆیان بە خاوەن دینەکە دەزانن. ئەدی ئەو کەسانەی خاوەن لە سەدا نۆوەدن، دەبیٚ چۆن ئەوان خۆیان بە خاوەن دینەکە نازانن.

**لە سەدا نۆوەتی موسلمانن، چۆن نەلێین ئیسلام ئاینی کوردە؟**

# کورته‌ی بابه‌ته‌که

ئه‌و بێدینیه‌ی له‌ کۆمه‌ڵگای کوردی هه‌یه‌، به‌رهه‌می عه‌قڵی سیکیوله‌ری کورد نییه‌، به‌ڵکو پرۆسه‌ی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌ له‌ گواستنه‌وه‌ی مێزی سیکیوله‌ری فارس یان عه‌ره‌ب دروستبووه. گه‌وره‌ سیکیوله‌رانی عه‌ره‌ب و فارس ئه‌وه‌نده‌ی ته‌قلیدکه‌ری قسه‌ی ڕووتی هه‌ندێ ڕۆژهه‌ڵاتناس ده‌که‌نه‌وه‌، خۆیان قسه‌ی نوێ ناڵێن.پانتایه‌کی زۆر له‌ نووسینه‌که‌، ته‌رخانکراوه‌ بۆ ڕه‌خنه‌گرانی قورئان که‌ له‌ ئه‌ده‌بیاتی کوردی ئه‌و دیارده‌یه‌ ده‌گمه‌نه‌، ئێمه‌ ئه‌وانه‌مان کردووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی سه‌نگی ئه‌و ڕه‌خنانه‌ بخه‌ینه‌ڕوو، که‌ له‌ قسه‌ی قوره‌یشیه‌ بێدینه‌کان زیاتر نیین.

له‌ لایه‌کی دی، ئه‌م نووسینه‌ ده‌سه‌لمێنێ که‌ ئیسلام ئایینی ڕه‌سمی کورده‌، چونکه‌ کورد له‌ عه‌ره‌ب زووتر قه‌بووڵی کردووه‌، چونکه‌ له‌ حاڵه‌تی داگیرکاری ڕزگاری کردووه‌.

ئایینی ڕه‌سمی کورد ئیسلامه‌! که‌ ده‌نووسین ئایینی ڕه‌سمی یاخود فه‌رمی ئه‌و ئایینه‌ نییه‌ که‌ له‌ ناو چوارچێوه‌ی هه‌ر سێ ده‌سه‌ڵاته‌که‌ی پیاوانی سیکیوله‌ری ده‌وڵه‌ت بۆ خاپاندنی خه‌ڵکی عه‌وام قسه‌ی له‌ سه‌ر ده‌کرێ! به‌ واتای ده‌نووسن ئایینی ده‌وڵه‌ت

ئیسلامیە، خۆشیان تەواو لە یاسا و ڕێساکانی ئیسلام بوون! ئەگەر بە زمانی ژمارە قسە بکەین: کورد لە سەدا نۆوەتی ٩٠٪ موسلمانە ! نزیکەی بە خۆهیشتی خۆی ئەوە چواردە سەدەیە ئیسلامی وەك ئاییتێکی پڕ چارەسەر وەرگرتووە. کورد وەکو عەرەب نەبووە، کە دەسەڵاتی عەرەبی و چەند کەللە ڕەقێکی عەرەبی قەبوڵی ئەو ئایینە نوێیەی بێ شەڕ نەکردووە هەرچی کوردە لە پاش ڕووخانی دەوڵەتی میدیا، کە نزیکەی هەزار ساڵ بووە لە ژێر دەستی فارس دابووە هەروەها وەکو عەرەب هیچ دەسەڵات و کیانێکی سیاسی نەبووە کە شەڕی لە پێناو بکات... ئەو کوردانەی کوژراویشن لە شەڕ بەرگریان لە دەسەڵاتی داگیرکەری فارس کردووە، کورد هیچ دەوڵەتێك و ئایینێکی سەربەخۆی نەبووە، تا خوانەخواستە ئیسلام بیڕوخێنی !ئەو لە سەدا دەیەی ١٠٪ کە لە سەر ئایینی ترن وەك: مەسیحی، زەردەشتی، کاکەیی، ئیزدیاتی....هەرچەندە ئەو لە سەدا دەیە لە چاو سەدا نۆوەتە لە رووی ژمارەوە کەمە!! بەڵام ئەو ژمارە کەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کراوەیی ئیسلام!! هەرچەندە زاتی خودا هیچ "ئایینێکی "تر جگە لە ئیسلام وەك ئایین قەبووڵ ناکات هەروەها خۆی وەك دوا ئایینی ئاسمانی خودا بۆ مرۆڤی ناردووە

ئیسلامە و پێی ڕازی بووە، بەڵام لە ڕووی باوەڕەوە، هەرچەندە خۆی تەبشیریە هەروەها ڕەحمەتە بۆ هەموو خەڵك، زۆر لە كەس ناكات كە باوەڕ بە خورتی بە ئیسلام بێنێت، بەلكو هەموو مرۆڤی ئازاد كردووە هەتا بە ئیسلام كافر بێت، هەرچەندە هەندێ كورد پێشتر و ئێستا بوونەتە مەسیحی...لە ئیسلامدا وەك ناوهێنان ناوی عیسا لە محمد زیاتر هاتووە! لە هەموو گرینگتر مەسیح پێغەمبەرێك بووە تەنیا بۆ جوولەكە هاتووە، جێی كورد، تورك، فارس.....نابێتەوە!!بە واتای وەك ئایین، كە نابێ دوای هاتنی ئیسلام هیچ ئایینێكی ئاسمانی شەریعەتی وی ئیشی پێ بكرێ، عیسا پێغەمبەر بۆ كورد نە هاتووە و بوونی كوردی قەبووڵ نییە! ئەو ئایینە وەك ئایینەكانی پێشوو ئایینی نەتەوەیین-تایبەتن بە نەتەوەی جیاوازەوە-. كورد لە هاوكێشەكانی هەر چوار ئینجیلی مرۆڤكردەدا شوێنی نییە!!!هەرچی زەردەشت و بوونی ئاڤێستایە زۆر تێبینی هەڵدەگرێ: جارێ هەر دەقەكە پێش هاتنی ئیسلام بە نزیكەی هەزار و سێ سەد ساڵ بە دەست ئەسكەندەری مەكدۆنی سوتێندراوە!! ئەو دەقەی كە هەیە لە سەردەمی ساسانیەكان نووسراوەتەوە! بە واتای ئایینەكە ئاسمانی نییە. زۆر ئاساییە كە زەردەشت پێغەمبەر بێ و شەریعەتەكەی لە ئاڤێستادا هەبێ!!

خودا خۆی له قورئان ده‌فه‌رموێ: "هیچ نه‌ته‌وه‌یه‌ك نییه پێغه‌مبه‌رمان بۆ نه نارد بێ به زمانی قه‌ومه‌كه‌ش دوا بێ تاكو — شه‌ریعه‌ته‌كه‌ی— بۆیان ڕوون بكاته‌وه ".ئه‌گه‌ر ئاڤێستا كوردی بێ، كێ زه‌رده‌شتی كوشتووه ؟؟ ئه‌گه‌ر ده‌قی ئاڤێستا به كوردی بێ و له ته‌ڕه‌ف خوداوه هات بێ، ئه‌وا زۆر ئاساییه قورئان و ئاڤێستا له مه‌سه‌له‌ی نوێژ و ڕۆژوو و زه‌كات...به یه‌كبچن چونكه هه‌ردووك له ته‌ڕه‌ف خودا دابه‌زیوه...هه‌ردووك بۆ ئه‌وه هاتوون كه بانگه‌وازی بكه‌ن بۆ په‌رستنی یه‌ك خودا. هیچ كه‌سێ نییه هه‌تا زه‌رده‌شتیناس‌و ئاڤێستاناس بی و بلّێ ئاڤێستا به كوردی بووه !! ئه‌دی بۆ فارسی نه بێت؟؟ به هه‌ر زمانێك بێ ده‌بێ ئاڤێستا چی تێدا بێ ؟؟ جیهانبینی ئاڤێستا چییه؟؟ئاڤێستا كوردی بێ یان نه‌بێ، ئایینێكی نه‌ته‌وه‌ییه به دابه‌زینی قورئان زه‌مه‌نی به سه‌ر چووه و له لای خوداوه چیتر قه‌بوولّ نییه !!!

له سه‌ر كاكه‌یی و ئێزدیاتی نادوێم، چونكه كتێبه‌كم له سه‌ریان هه‌یه به ناوی: "زمانی ئایینی كورد " و هه‌روه‌ها ژماره‌یان زۆر كه‌مه !

له سیكیوله‌ری كورد ده‌پرسم ئاخۆ شتێك هه‌یه به ناوی كۆمه‌لّگای كوردی؟؟ بۆ زانایه‌كی كورد له سه‌رده‌می سیكیولاریزم

دەرنەکەتووە ؟؟ بەر لەوەی وەڵامی پرسیارەکان بدەینەوە یان گریمان بکەین یان پێشبینینی بکەین؟؟ ئەوا وەك گوتمان سیکیولەرە کوردەکان خاوەن هیچ هزرێکی نوێ نین ئەوەی دەیلێن سیکیولەریتر لە نەتەوەی دی گوتویەتی!

کۆمەڵگای کوردی وەك جوگرافیا بوونی هەیە، بەڵام هەرچی کۆمەڵگای هزری کوردیە لە سەردەمی سیکیولاریزمەوە بوونی نییە. لە رووی کۆمەڵناسی و سایکۆلۆژیەوە شرۆڤەوە نەکراوە! لە سەردەمی ئیسلامیەوە چەندەها کورد کتێبی ئاین و مێژووی وەهایان هەبووە کە بۆنەتە ژێدەر بۆ نەتەوەی غەیرە-کورد، بەڵام لە سەردەمی سیکیولاریزمی کوردی هیچ کوردێك لە شانۆ، ئەدەب، سیاسەت و جیهان بوونی نییە!!

ئەوروپا زۆری لە سەر باس دەکرێ، بە جۆرێك بەشێك لە سیکیولەرە کوردەکان ئەوەندە بە ئەوروپا و سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوروپا موعجیب و شاگەشکەن هەروەها وا ئەوروپا بە خەڵکی عەوام دەناسێنن کە بەهەشتێکە لە سەر زەوی!! ئەوە ئەوروپا بەشداریکردووە لە بەستنی چەندەها رێککەوتنامەی شاراوە و ئاشکرا دژ بە کورد هەروەها ئێستاش کورد وەك چەند عەشیرەتێك دەبینێت بۆیە گرنگی بە زارەکانی زمانی کوردی لە جیاتی زمانی کوردی دەدات...

# ناوەڕۆك

بابەت | لاپەڕە